# سیاسەتی ئەمریکا لە کوردستان لە روانگەی پسپۆرانی رۆژئاوایی

ئامادە کردنی:
وریا رەحمانی





هەولێر - ٢٠١١

# سیاسەتی ئەمریکا لە کوردستان
# لە روانگەی پسپۆڕانی رۆژئاوایی

ئامادەکردنی
وریا رەحمانی

## دیمانە لەگەڵ:

پرۆفیسۆر مایکڵ گەنتەر
دۆکتۆر سین کان
دۆکتۆر واین وایت
پرۆفیسۆر رابێرت ئۆلسۆن
دۆکتۆر دانیێل سیرڤیر
دۆکتۆ ئۆفرا بینگیو
پرۆفیسۆر لیام ئاندیرسۆن
پرۆفیسۆر توماس ئابریسیۆ
دۆکتۆر ئالێند مێزێل
پرۆفیسۆر هاکان ئوزئوغلوو
دۆکتۆر گونەش تەزجور
دۆکتۆر دەیڤید رۆمانۆ
دۆکتۆر ئیسماعیل بیشکچی
جاناتان رەندێل
دۆکتۆر ویلیام بیل
پرۆفیسۆر مایکڵ ئوهانلۆن
دۆکتۆر کریستینا کۆیگێن
دۆکتۆر کارۆل پرۆنهۆبێر
پرۆفیسۆر ژۆردی تێژەل
دۆکتۆر ماریانا شرونتاکی
پرۆفیسۆر لوقمان محۆ
پرۆفیسۆر مایکڵ نەهمە

**پێرست:**

## بەشداربووانی ئەم كتێبە:

**پروفیسۆر مایكیل گەنتەر**

ماموستای زانستە سیاسیەكانە لە زانكۆی تنیسی لە ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكا و سكرتێری رێكخراوی EUTCC لە بروكسل. مایكێل گەنتەر تا ئێستا ٧ كتێبی دەربارەی كێشەی كورد نووسیوە و ٧٢ وتاری دەربارەی بارودوخی كورد لە رۆژنامە بەناوبانگەكانی جیهاندا بڵاو كردووەتەوە .

**دۆكتۆر سین كان**

لە بەرنامەدارێژەرانی بەشی عێراقی ئینیستیتۆی ئاشتی ویلایەتە یەكگرتووەكانی ئەمریكایە(USIP) و وەك پسپۆری كاروباری سیاسی لە لێژنەی یارمەتیدەری نەتەوە یەكگرتوەكان لە عێراق (UNAMI) لە ٢٠٠٦ تا ٢٠٠٩ لە هەولێر ، بەغداد ، موسڵ و كەركووك كاری كردوە. سین كان لە كۆمەڵێك بەرنامەی ناوخۆی عێراقدا بەشداری كردوە وەك: راوێژدان بە پارلمانی عێراق ، شیكردنەوەی یاسای نەوت و دابەشكردنی داهات، چاودێریكردن بە سەر هەڵبژاردنی پارێزگاكانی عێراق و ئامادەكردنی راپۆرتەكانی (UNAMI) دەربارەی كەركووك و ناوچە جێناكۆكەكانی دیكە بۆ دەوڵەتی عێراق و حكوومەتی هەرێمی كوردستان.

سین كان ساڵی ٢٠٠٩-٢٠١٠ بەرپرسی بەشی رۆژهەلاتی ناوەڕاستی ئیدارەی كاروباری دەرەوەی نەتەوە یەكگرتوەكان بوە ، ساڵی ٢٠٠٥-٢٠٠٦ بەرپرسی "دامەزراوەی كێشەكانی هەزارە (MCC)ی ولاتە یەكگرتوەكانی ئەمریكا" بوە و ساڵی

٢٠٠٤ ئەندامی نوێنەرایەتی باڵای ئەمریکا بوە لە بوسنی هرزگوین .

**دۆکتۆر واین وایت**

سەرۆکی بەشی عێراقی دیپارتمانی زانیاری و شیکردنەوەی کاروباری رۆژهەڵاتی نزیک و باشووری ئاسیای وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا (INR/NESA) بوە لە ساڵی ٢٠٠٣ تا ٢٠٠٥ و جێگری سەرۆکی (INR/NESA) بوە لە ساڵی ٢٠٠٢ تا ٢٠٠٥. ساڵی ١٩٩٠ تا ٢٠٠٢ نوێنەری تایبەتی وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوە لە رێکخراوی ناتۆ بۆ گروپی کاری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و سەرۆکی بەشی ولاتی مەغرب، نیمچەدورگەی عەرەب و ئێران و عێراق بوە لە(INR/NESA). ساڵی ١٩٨١-١٩٨٦ ئەندامی کارای بەشی زانیاری وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا بوە بۆ کاروباری ئێران و عێراق لە ئەنجومەنی هاوکاری دەوڵەتانی عەرەبی کەنداو (GCC) و ساڵی ١٩٨٧ تا ١٩٩٠ ئەندامی گروپی بەرگری و سەربازی ئیسرائیل بوە بۆ کاروباری ئیران، عێراق و سوریە. ساڵی ١٩٨٣ بەرپرسی بەشی سیاسی دەفتەری پاراستنی بەرژەوەندیەکانی ئەمریکا بوە لە عێراق و ساڵی ١٩٧٤ تا ١٩٧٦ بەرپرسی بەشی سیاسی باڵوێزخانەی ئەمریکا بوە لە ولاتی نیجر. واین وایت ئێستا پسپۆڕ و ئەندامی کارای ئەنجومەنی سیاسەتی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە لە واشنتۆن.

**پرۆفیسۆر رابێرت ئۆلسۆن**

مامۆستای زانستە سیاسیەکان و سیاسەتی رۆژهەلاتی ناوەڕاستە لە زانکۆی کینتاکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. رابێرت ئۆلسۆن زیاتر لە ١٠ کتێبی دربارەی کێشەی کورد (بە تایبەت کوردەکانی تورکیا) نووسیوە و زیاتر لە ٨٠ وتاری لە رۆژنامە نێونەتەوەییە بەناوبانگەکاندا دربارەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بلاو کردوەتەوە.

**دۆکتۆر دانییل سێرڤیر**

بەڕێوەبەری ئینیستیتۆی ئاشتیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە (USIP) . راوێژکاری وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بووە و لە ساڵی ١٩٩٠ تا ١٩٩٣ رێکخەری کاروباری باڵوێزخانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان بووە لە ئیتالیا. لە ساڵی ١٩٩٤ تا ١٩٩٦ نوێنەری تایبەتی دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بووە لە فدراسیۆنی بۆسنیا و وەك ناوبژیوان لە نێوان کرواتەکان ، موسلمانەکان ، ئالبانیایی و سیربەکان و رێکخەری "وتووێژەکانی ئاشتی دایتۆن"دا کاری کردووە. دانییێل سێرڤیر ئەم دواییانە بەڕێوەبەری کارگێڕی "کومیسیونی بەیکێر- هامیلتۆن" بووە لە عێراق و بەردەوام سەردانی عێراق، هەرێمی کوردستان و ناوچە جێناکۆکەکانی کردووە.

**دۆکتۆ ئۆفرا بینگیو**

مامۆستای بەشی مێژوویە لە زانکۆی تلابیبی ئیسرائیل و ئەندامی کارای ناوەندی موشیدایانە بۆ توێژینەوە دەربارەی رۆژهەلاتی ناوەڕاست و ئەفریقیا. ئۆفرا بینگیو پسپۆری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانە و تا ئێستا چەند کتێب و کۆمەڵێك وتاری دەربارەی ناکۆکییە ئەتنیکی و نەتەوەییەکان، بەتایبەت لە عێراق بڵاو کردوەتەوە .

**پرۆفیسۆر لیام ئاندیرسۆن**

مامۆستای زانستە سیاسییەکانە لە زانکۆی" رایت " لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. ئاندێرسۆن تا ئێستا ٤ کتێبی دەربارەی سیاسەتی رۆژهەلاتی ناوەڕاست، قەفقازیا و عێراق نووسیوە(لەوانە کتێبی "داهاتووی عێراق: دیکتاتۆری، دیموکراسی یا دابەشبوون؟") و کۆمەڵێك کۆڕوکۆبوونەوەی لە سەر کێشەی کورد ، کەرکووك و ناکۆکییەکانی نێوان حکوومەتی هەرێمی کوردستان و حکوومەتی عێراق بەڕێوە بردووە.

**پرۆفیسۆر توماس نابریسیۆ**

مامۆستای زانستە سیاسییەکانە لە زانکۆی داکۆتای باکوور لە ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و بەڕێوەبەری ناوندی توێژینە نێونەتەوەیەکانە. توماس ئابریسیۆ پسپۆری پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان و ناکۆکییە ئەتنیکییەکانە و تا ئێستا کۆمەڵێك وتار و ٥ کتێبی دەربارەی کێشەی نەتەوەکان، دیموکراسی و یاسا نێونەتەوەییەکان بڵاو کردوەتەوە.

---

**دۆکتۆر ئالێند میزێل**

سەرۆکی ئینیستیتۆی پاراستنی کەمینەکانە (MCI) لە واشینتۆن و کۆمەڵێک وتاری دەربارەی کێشە و لۆبی کورد لە ئەمریکا بڵاو کردوەتەوە.

**پرۆفیسۆر هاکان ئوزئوغلوو**

مامۆستای بەشی مێژووی زانکۆی ناوەندی فلۆریدا و بەشی زمان و شارستانییەتی رۆژهەڵاتی نزیك لە زانکۆی شیکاگۆی ئەمریکایە. هاکان ئوزئوغلوو کتێبێك و نزیکەی ٢٠ وتاری دەربارەی کێشەی کورد و دەوری ناسیونالیزمی کورد لە هاوکێشە نێونەتەوەییەکاندا بڵاو کردوەتەوە.

**دۆکتۆر گونەش تەزجور**

مامۆستای بەشی زانستە سیاسییەکانە لە زانکۆی لویولا لە شیکاگۆ لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. گونەش تەزجور تا ئێستا کتێبێك و زیاتر لە ٢٠ وتاری دەربارەی کێشەی کورد لە گۆڤارە نێونەتەوەییەکاندا بڵاو کردوەتەوە .

**دۆکتۆر دەیڤید رۆمانۆ**

مامۆستای پەیوەندییە نێونەتەوەییەکانە لە کۆلیژی رۆدزی کەنەدا و تا ئێستا چەند وتاری دەبارەی بزووتنەوەی کورد لە رۆژنامە نێونەتەوەییەکاندا بڵاو کردوەتەوە. دەیڤید رۆمانۆ نووسەری کتێبی "بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد"ـە کە ساڵی ٢٠٠٦ لە لایەن زانکۆی کەمبریجەوە چاپ و بڵاو بوەتەوە.

**دۆکتۆر ئیسماعیل بیشکچی**

کۆمەڵناسی تورك، ئیسماعیل بیشکچی بە هۆی داکۆکی بەردەوام لە مافی گەلی کورد لە تورکیا لە سەراسەری جیهاندا وەك کەسایەتییەکی مرۆڤدۆست و ئاشتیخواز ناوبانگی دەرکردوە و چەند خەلاتی نێونەتەوەیی بە دەست هێناوە. دۆکتۆر بیشکچی بە هۆی نووسینی کۆمەلێك کتێب دەربارەی کێشەی کورد لە تورکیا تا ئێستا چەند جار لەگەڵ گرتن و زیندان رووبەڕوو بووەتەوە و ساڵەهای ساڵ لە زینداندا بووە. یەکێ لە کتێبەکانی دۆکتۆر بیشکچی بە ناوی "کوردستان: کۆلۆنی (موستەعمەرەی) هاوبەشی چەند دەوڵەت" وەرگێردراوەتەوە سەر گەلێ لە زمانە زیندووەکانی جیهان و دەوری گرنگی لە ناساندنی کێشەی کورد لە تورکیا بە جیهانی دەرەوە بینیوە.

**جاناتان رەندیل**

جاناتان رەندێل، رۆژنامەنووسی ئەمریکایی بە ماوەی ۳۰ ساڵ لە رۆژنامەی "واشنتۆن پوست"دا کاری کردووە و بە تایبەت بە هۆی راپۆتەکانی دەربارەی کێشەکانی جیهانی سێیەم و بزووتنەوە نەتەوەییەکان ناوبانگی جیهانی هەیە. جاناتان رەندێل کۆمەلێك کتێبی دەربارەی کێشە سیاسییە نێونەتەوەییەکان نووسیوە، بەردەوام سەردانی کوردستانی کردووە و لە نزیکەوە لەگەڵ بزووتنەوەی کورد و رێبەرانی کورددا ژیاوە. کتێبەکەی جاناتان رەندێل دەربارەی رووداوەکانی کوردستان بە ناوی "بەم رسواییە کام لێبوردن"

تا ئێستا چەند جار لە چاپ دراوە و وەرگێڕدراوەتە سەر زۆربەی زمانەکانی زیندووی جیهان.

**دۆکتۆر ویلیام بیل**

مامۆستای بەشی زانستە بەرگرییەکانی جەنگە لە کۆلێژی شاهانەی زانکۆی بەریتانیا و تا ئێستا چەند کتێب(لەوانە مێژوی ناتۆ) و کۆمەڵێ وتاری دەربارەی پەیوەندییەکانی کوردستانی عێراق و تورکیا، ئاسایشی جیهانی و سیاسەتی نێونەتەوەیی بڵاو کردووەتەوە .

**پرۆفیسۆر لوقمان محۆ**

مامۆستای زانکۆی ئەیالەتی نیویۆرک بووە و ئێستا مامۆستای بەشی زانستە سیاسیەکانە لە زانکۆی ئیندیانا لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لوقمانی محۆ کوردی لوبنانە و تا ئێستا کۆمەڵێ کتێبی بە نرخی بە چاپ گەیاندووە کە هەندێکیان بریتین لە:

١- کولتوور و کۆمەڵگای کورد(٢٠٠١)
٢- کورد و کوردستان(١٩٩٧)
٣- زانیارییەکان و کتێبخانەکان لە جیهانی عەرەبدا(١٩٩٩)
٤- سانسۆر لە جیهانی عەرەب(٢٠٠٦)

**پرۆفیسۆر مایکێل نەهمە**

مامۆستای کۆلیژی زانستە سیاسییەکان و دیپلۆماسییە لە زانکۆی ئەمریکایی- لوبنانی نۆترەدام و تا ئێستا کۆمەڵێک کتێب و وتاری لە سەر کێشەی کورد و رۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە گۆڤار و رۆژنامە نێونەتەوەییەکاندا بڵاو کردووەتەوە .

**پرۆفیسۆر مایکێل نوهانلۆن**

مامۆستای زانکۆی پرینسیتۆن و زانکۆی جان هاپکینزە و ئەندامی ئینیستیتۆی نێونەتەوەیی تویژینەوە ئیستراتژیکەکان و ئەنجوومەنی پەیوەندیەکانی دەرەوەی ئەمریکایە و ساڵی ٢٠٠٩ راویژکاری کۆمیتەی ئاسایشی نێونەتەوەیی وەزارەتی دەرەوەی ئامریکا بوە . ئوهانلۆن ئەندامی کارای بەشی سیاسەتی دەرەوەی ئینیستیتۆی برۆکینزە و پسپۆڕی ستراتژی ئاسایش و بەرگری نەتەوەیی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. مایکێل ئوهانلۆن تا ئێستا ١١ کتێبی دەربارەی ئاسایشی نەتەوەیی و سیاسەتی دەرەوەی ئامریکا بەتایبەت لە عێراق و ئەفغانستان بڵاو کردوەتەوە.

**دۆکتۆر کریستینا کۆیگێن**

کۆمەڵناس و لێکۆڵەری فینلاندیە و تێزی دۆکتراکەی دەربارەی ژینۆسایدی کورد لە باکووری کوردستان نووسیوە. دۆکتۆر کریستینا کۆیگێن بە هۆی داکۆکی لە مافی گەلی کورد لە تورکیا لەگەڵ لێپرسینەوە و دەرکردن رووبەڕوو بووەتەوە و بە هۆی ئەو مەسەلەیە پەیوەندییەکانی نێوان

دەوڵـەتـی فینلانـد و تورکیـا بـۆ مـاوەیـەك گـرژ بـووە . د. کریستینا تا ئێستا ٣ کتێبی دەربـارەی کێشەی کورد (٢ کتێب بە زمانی فینلاندی و ١ کتێب بە زمانی ئینگلیزی) نووسیوە و ئێستاش سـەرقـاڵی نووسـینی کتێبێکـە دەربـارەی "کـورد و ژینۆساید".

**دۆکتۆر کارۆل پرۆنهۆبێر**

نووسـەر و تـوێژەرێکی ونزوئیلایـی- ئەمریکـایە کە نـزیکەی ٣٠ سـاڵە دەربـارەی کێـشەی کـورد لێکـۆڵینەوە دەکـات و تـا ئێستا کۆمەڵێک وتاری دەربارەی بارودۆخی کورد لە رۆژنـامە نێونـەتەوەیەکانـدا بـڵاو کـردوەتـەوە. کـارۆل پرۆنـهۆبێر سـاڵی ٢٠٠٩ کتێبی "خۆلیا و مەرگی عەبدوڕەحمانی قاسملوو" بە زمانی ئینگلیزی و ئیسپانیایی بڵاو کردوەتەوە.

**پرۆفیسۆر ژۆردی تێژەل**

مامۆسـتای بەشـی مێـژوویە لە زانکۆکـانی سوئیـسرا و مامۆسـتای ئینیـستیتۆی تـوێژینەوە نێونەتەوەیەکـانی "ژنویـف"ی سوئیـسرایە. ژۆردی تێـژەل کۆمەڵێـک کتێبـی دەربارەی کورد، بەتایبەت کوردەکانی سوریە بڵاو کردوەتەوە.

**دۆکتۆر ماریانا شرونتاکی**

تـوێژەر و پسپۆڕی پەیوەنـدیە نێونـەتەوەیەکـانە لە زانکـۆی ئیکـستێری بریتـانیـا. ماریـانـا شـرونتاکی نووسـەری کتێبـی "کـوردەکـان و سیاسـەتـی دەرەوەی ویلایـەتـە یـەکگرتـوەکـانی

ئامریکا: پەیوەندیە نێونەتەوەیەکان لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست"-ە کە ساڵی ٢٠١٠ چاپ و بڵاو بوەتەوە.

**نوام چامسکی**

پرۆفیسۆر ئاورام نوام چامسکی ساڵی ١٩٢٨ی زایینی لە شاری فیلادلفیا کە ناوەندی ئەیالەتی پنسیلڤانیایە، چاوی بە دونیا هەڵێناوە. چامسکی هەر لە سەردەمی زانکۆوە دەستدەکات بە لێکۆڵینەوە سەبارەت بە زماننناسی و یەکەمین کتێبی خۆی لە ژێر ناوی "پێکهاتەی مەنتقی بیرۆکەی زماننناسی" دەنووسێ. چامسکی بەمە راناوەستێ و لە ساڵی ١٩٥٩ی زایینی لە ئنیستیتۆی ماساچوست چالاکییە ئاکادیمیکەکانی دەستپێدەکات و دوو ساڵ دواتر لە تەمەنی ٣٣ ساڵیدا هەر لەو ئنیستیتۆیە دەبێتە مامۆستای زمانە بیانیەکان و کتێبە بە ناوبانگەکەی بەناوی "زماننناسی دکارتی" چاپ و بڵاو دەکاتەوە. چامسکی شارەزایەکی زۆری لەسەر زۆربەی زمانە زیندووەکانی جیهان هەیە و بەردەوام بەپەرۆش بووە بۆ نەفەوتانی زمانی گەلانی بێ دەسەلات و بێ دەوڵەت لە جیهاندا.

چامسکی لە ساڵەکانی ١٩٦٠دا دەستدەکات بە رەخنەگرتن لە هەندێ لە سیاسەتەکانی دەوڵەتی ئەمریکا و کۆمەڵێك وتار و بابەت لە ژێر ناوی " بەرپرسیارێتی روناکبیران "دەنووسێ کە دەنگدانەوەی زۆری دەبێت. ئەم کۆمەڵە وتارە لەگەڵ کتێبێکی دیکە ساڵی ١٩٦٩ لە ژێر ناوی "هێزی ئەمریکا و دەسەلاتدارانی نوێ" چاپ و بڵاو دەبێتەوە کە لە

ئـەنجامیـدا چامـسکی وەك کـەسـایەتییـەکـی ئـازادیخواز و مرۆڤدۆست ناوبانگ دەردەکات.
چامـسکی ئێـستا لــەریـزی فەیلەسـوفانی هــەرەگــەورەی جیهاندایە و بـەتایبـەت لـە بـواری زماننـاسییەوە خزمـەتێکی زۆری بـە کۆمـەڵگـای ئاکادیمیك کـردووە و بـەرهـەمـەکـانی لـە ریـزی پربایـەخترین و پڕفرۆشـترین بـەرهـەمـە زانـستییەکـانی جیهاندان .
چامسکی وەك خۆی دەڵێت لایەنگری هـیچ دەوڵـەت، رێکخـراو حیزب و تاقمێك نـەبـووە و هـەمیشـەش وەك کـەسایـەتییـەکـی ئـازادیخواز، رونـاکبیرێکی سیاسـی و رخنـەگرێکـی دەروەسـت داکۆکی لـە مـافی گـەلانی چـەوساوە و بنـدەست (بـە تایبـەت گەلی کورد )کردووە و بەردەوام رەخنەی لە سیاسەتی ئەمریکا بەنیسبەت پشتیوانیکردن لە دەوڵـەتـە سەرکووتکـەرەکان، بـە تایبـەت دەوڵــەتـی تورکیـا گرتـووە و بـۆ خۆیـشی چـەنـدجار سەردانی کوردستانی تورکیای کردووە.

## پێشەکی

کێشەی کورد چی پێگەیەکی لە هاوکێشە ناوچەیی و جیهانیەکان و سیاسەتی دەرەوەی دەوڵەتی ئەمریکادا هەیە؟ ئایا ئەمریکا هیچ سیاسەت یا ئیستراتژیەکی بۆ کورد وەک نەتەوەیەک هەیە؟ ئەمریکا چۆن دەڕوانێتە ئازموونی هەرێمی کوردستان ؟ ئایا ئەمریکا وەک هاوپەیمان سەیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکات و چەندە پشتیوانی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکات؟ هەڵوێستی ئەمریکا بە نیسبەت مەسەلەی کەرکووک و ناوچە جێناکۆکەکان چیە؟ ئێمەی کورد چی پێویستیەکمان بە ئەمریکا وەک زلهێزی جیهان هەیە و بۆ پەرەپێدانی پەیوەندیەکانمان لەگەڵ ئەمریکا دەبێ چی بکەین و چۆن دەتوانین کەڵک لە ئەمریکا و رۆژئاوا وەربگرین بۆ ئەوەی دۆزی خۆمان پێش بخەین؟

وەڵامی ئەو پرسیارانە و کۆمەڵێک پرسیاری دیکە لەمێژە سەرقاڵی کردووم و بەتایبەت پاش بڵاوکردنەوی کتێبی "کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی ئەمریکادا* و ئەو پیشوازیە باشە کە لەو کتێبە کرا، هاندرام زیاتر بە شوێن مەسەلەکەدا بچم و تا ئەو شوێنە کە پێمدەکرێ بە وەڵامی ئەو پرسیارانە بگەم، هەربۆیە پەیوەندیم لەگەڵ ئەو پسپۆڕە زیاتر ئەمریکایانە گرت کە شارەزای ئەو بابەتە بوون.

---

*کورد و کوردستان لە بەڵگەنامە نهێنیەکانی ئەمریکادا، بەرگی یەکەم: کوردستانی عێراق(٨٥٠ لاپەڕە)، بەرگی دووەم: کوردستانی ئێران و تورکیە (٧٥٠ لاپەڕە)، وەرگێڕان لە ئینگلیزیەوە: وریا رەحمانی، دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی رۆژهەڵات، هەولێر، ٢٠٠٩

هەندێکیان هەر لە سەرەتاوە دەیانگوت بە هۆی ئەوەی بۆ وەزارەتــی دەرەوەی ئەمریکــا یــا نەتەوە یەکگرتووەکــان کــار دەکەن نــاتوانن بە شـیوەی فەرمــی لەو دیمانـەیەدا بـەشـداری بکەن بەڵام ئامادەن بە شێوەی نافەرمی وەڵامی پرسیارەکانم بدەنەوە. بەر هەرحاڵ توانیم زۆربەی ئەو کەسانە رازی بکەم و هەنـدێکیانم لە نـزیکەوە ببینـی و راستـەوخۆ قسـەم لـەگەڵ کـردن و وەڵامــی هەنـدێکی دیکەشـیانم لە رێگـای ئـیمەیلەوە وەرگرت. سەرەنجام ئەنجامی ئەو دیمانە و گفتۆگۆیانەم کرد بە کـوردی و بەو ئەنجـامە گەیـشتم کە باشـتر وایە بـیکەم بە کتێبێک بۆ ئەوەی ببێ بە سەرەتایەک بۆ هاندانـی لێکۆلینەوە و بەدواداچوونـی زیاتری ئەو مەسەلەیە .

هــیچ گومــان لەوەدا نــیە کە ئەمریکــا تێـوەگلاوەتە نێـو کێشەی کورد بە گشتی و کوردستانی باشوور بە تـایبەتی و تـا ئـاستێک پێویستی بە هاوکاری کورد هەیە و مەسـەلەی کوردی عێـراق جێگــای خـۆی لە نێـو سیاسـەتی دەرەوە و تەنــانەت ئـاسایــشی نەتەوەیـــی ئەمریکـــادا کـــردوەتەوە، کەوابـــوو دەرفەتێکی گەورە بۆ کورد رەخساوە خۆی زیـاتر لە ئەمریکـا نزیـک بکــاتەوە و لەو پەیوەنـدیە بـۆ گەیـشتن بە ئامــانجی نەتەوەیـی خـۆی کەڵـک وەربگرێت. ئـیمەی کـوردیش بە هـۆی ئەوەی دەوڵەتــی خۆمــان نەبــوە و بە شـیوەی فەرمــی لەگەڵ رۆژئاوا پەیوەندیمان نەبووە ، خاوەن ئەزمـوونێکی ئەوتـۆ نـین ، کەوابوو دەبێ لەم پەیوەندیەدا چی بکەیـن و چۆن لەگەڵ رۆژئــاوا، بە تـایبەت ئەمریکـا هەڵـسوکەوت بکەیـن. هیـوادارم

ئەم کتێبە بتوانێ وەڵامی سەرەتایی هەندێ لەو پرسیارە گرنگانە بداتەوە .

هەروەها کە ئامازەی پێکرا نەتەوەی کورد خاوەن ئەزموونێکی ئەوتۆی لۆبیکردن نیە بەڵام هەروەها کە دنیای دەرەوە دەیڵێت و لەم کتێبەشدا پسپۆڕانی بێلایەنی رۆژئاوایی ئامازەیان پێکردوە، ئازموونی حکوومەتی هەرێمی کوردستان سەلماندوویەتی کە نەتەوەی کورد و دەوڵەتی کوردی توانایی ئەوەی هەیە واقعبینانە و سەرکەوتووانە لەگەڵ دنیای دەرەوە هەڵسوکەوت بکات و بە خۆشیەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان هەنگاوی زۆر ئەرێنی هەڵگرتووە و کۆمەڵێک ئەنجام و دەستکەوتی باشی لە ئاستی سیاسەتی دەرەوە بەدەست هێناوە. بە هیوای ئەوەی ئەو رەوتە رۆژ بە رۆژ زیاتر بچێتە پێش و سەرەڕای هەموو کەموکورتیەکان دەوڵەتی کوردی زیاتر خۆی بە کۆمەڵگای جیهانی بسەلمێنێت و زیاتر دۆزی کورد بەرەوپێش ببات.

وریا رەحمانی

پاریس

ARBABA380@GMAIL.COM

## پێشەکی- دۆکتۆر مەحموود عوسمان

کێشەی کورد وەک کێشەی نەتەوەیەک هیچ کات لە ئەجیندای ئەمریکادا نەبووە (ئیستاش نییە)، ئەمریکا زۆرتر لەگەڵ حکوومەتەکان بووە، جار ناجار رێکخراوە مرۆڤدۆست و خەیرییەکان یارمەتی مرۆڤیان داوە بە کورد، بەڵام وەک سیاسەت، حکوومەتی ئەمریکا قەد وەکو نەتەوەیەک حیسابی بۆ کورد نەکردووە، بە تایبەت بەردەوام دژایەتی کوردەکانی تورکیای کردووە و قەد گرنگی بە کوردەکانی ئێران و سوریا نەداوە.

یەکەم جار کە پەیوەندی رەسمی لە نیوان ئەمریکا و کوردی عێراق دروست بوو، ساڵی **١٩٧٢ بوو، ئەویش لە** سەر پێداگری مەلا مستەفا بارزانی لە سەر شا و **پێداگری( شا )**ش لە سەر ئەمریکا . وەختی خۆی کە هاوپەیمانی سۆڤیەت و عێراق کرا شا ترسا و ویستی ئەمریکاش لەم لاوە تەییدی کورد بکات ، پەیوەندییەکیان دروست کرد لەگەڵ شۆڕشی کورد، بەڵام نهێنی لە سەدا سەد یەعنی هیچ کەس نابێ بەم پەیوەندیە بیزانیبایا واتا پەیوەندییەکی لەرزۆک بوو. تەبعەن هەموو شتێک بە هۆی ئێرانەوە بوو یەعنی کلیلی پەیوەندییەکە شا بوو، هەر بۆیە ساڵی١٩٧٥ کە پەیمانی جەزایر مۆر کرا، شا وتی تەواو ، پەیوەندییەکە تەواو بوو و پاش ئەوە کە شۆڕشی ئەیلوول تیکچوو پەیوەندییەکەش هیچ نەما. هەندێ کەس ئەم سیاسەتەی ئەمریکا بە خیانەت دەزانن، بەڵام وەختی خۆی ئەمریکا هیچ ئیلتیزامێکی بەرامبەر بە ئیمە نەبووە تا بڵێین خیانەتی لە ئیمە کردووە،هیچ بەڵێنێکیان بە ئێمە

نـەدابـوو ، یەکەم وەفـد کە چـووە ئـەمریکـا، مـن و رەحمـەتـی ئیدریس بارزانی بووین، ئـەمـەیان بـە روونـی پێمـان وت، لێیـان نـەشاردینـەوە. بـەهـەرحـاڵ بـەرژەوەنـدیـان لـەوەدا بـوو کـردیـان و لایان برد، دەتوانین بڵێین فێڵیان لە کورد کرد.

پـاش ئـەوە لـە کـاتـی شـەڕی ئێـران و عێـراق، ئـەمریکـا بـە تـەواوی دۆسـتـی سـەدام بـوو. ئـێمـە ئـەنفـال کـراین، ئـێمـە کیمیابیمـان لێـدرا، هـەمـوو وڵاتـەکـەمـان وێـران کـرا، ئـەمریکـا لـەگـەڵ سـەدام بوو، تـەنـانـەت چـەکی کیمیاییشی دابـوویـە یـانـی دژی ئێمە بوو.

بـارودۆخـەکـە وا بـوو هـەتـا سـاڵـی ۱۹۹۱ کـە عێراق کـوێتـی گـرت، پاشـان عێـراق بـوو بـە مـەسـەلـەیـەکی گـرنـگ بـە نیـسبـەت ئـەمریکا و حیسابی بـۆ کـوردیش کـرد وەکـوو فاکتۆرێـک لـە نـاو عێراقـدا. ئیتـر پـەیوەنـدی پـەیـدا بـوو، لـە پێشا پـەیوەنـدییـەکـە مرۆڤی بوو، بـەڵام وردە وردە تـایبـەتـمـەنـدی سیاسیشی بـە خـۆوە گرت تا ئـەوەی کـە سـاڵـی ۲۰۰۳ بڕیاریان دا سـەدام بـڕووخێنن، پاشان پـەیوەندی کوردی عێـراق و ئـەمریکـا پێبینـایـە قۆنـاخێکی گرنـگ، پـەیوەنـدییـەکـە زیـاتر بـوو و ئێـستـاش بـەردەوامـە . ئێـستـاش ئـەمریکـا دیـسان پـەیوەنـدی لـەگـەڵ کـورد نیـیـە وەک نـەتـەوەیـەک بـە جیا، وەک هـاوپـەیمـان نـا بـەڵـکوو وەک دۆسـتێک هـەڵسوکـەوت لـەگـەڵ کوردسـتـانـی عێـراق دەکـات چـوونکـە کـورد بـەشێکی گرنگـە لـە عێراق، هەرێمـی هـەیـە و حکـوومـەتـی هـەیـە، لـە بـەر ئـەوە پـەیوەنـدیـان لـەگـەڵـی هـەیـە وەک هـەرێمێکـی فیدراڵ لە ناو عێراقدا.

پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا بۆ ئێمە گرنگە، زۆر هەوڵیشمان داوە و دەبێ هەوڵیشی بۆ بدەین بۆ ئەوەی پەیوەندیمان لەگەڵیان هەبێ و هاوکاریمان بکەن یانی حیسابێ بۆ کورد بکەن، کورد نەتەوەیەکە نزیکەی ٥٠ ملیۆنە، ئەم نەتەوەیە هەر هەمووی دەیەوێت دۆستایەتی لەگەڵ ئەمریکا بکات، بە کورتی کورد هەمیشە ویستوویەتی پەیوەندی لەگەڵ ئەمریکا هەبێت و هاوکاری بکات بەڵام ئەمریکا قەد نەیویستووە تێکەڵاوی کێشەی کورد بێت و هەمیشە بە کێشەیەکی ناوخۆیی زانیوە ، ئێستاش هەر بە کێشەیەکی ناوخۆیی دەزانێت.

بۆ پەرەپێدانی پەیوەندییەکانی کورد لە گەڵ ئەمریکا بە بۆچوونی من دەبێ چەند شت بکرێت : یەکەم ئێمە یەک بین لە نیو خۆماندا، دووەم بە وردی بکۆڵینەوە لە سیاسەتی پەیوەندی ئەمریکا بۆ ئەوەی تێبگەین ئەم سیاسەتە چۆنە، ئەوەشمان لە بیر نەچێت هەموو شتێ بە پێی بەرژەوەندییە، ئەوان بەرژوەوندی خۆیان و ئێمەش بەرژەوەندی خۆمان. حیسابی ئانکارا و بەغدادیش هەیە لە کێشەکەدا، مەسەلەی کورد تا رادەیەکی زۆر رای تورکیای تێدایە یانی فاکتۆری تورک شتێکی سەرەکییە لە سیاسەتی ئەمریکا بەرامبەر بە کورد، ئەمەش فاکتۆرێکی نەرێنییە بۆ ئێمە چونکە تورکیا هەمیشە سیاسەتی باش نەبووە بە رامبەر بە کورد. سێیەم ئێمە دەبێ لۆبی خۆمان بەردەوام بکەین و بەهێزتری بکەین لێرە و لە ئەمریکا و لە هەموو شوێنێک بۆ ئەوەی زیاتر کێشەی خۆمانیان بۆ روون بکەینەوە ، بۆ ئەوەی ئەمریکا لێی

تێبگات. چوارەم جارجاریش ئێمە دەبێ بڵێین نا، ئەوە نییە ئەمریکا هەر وەختێ هەرشتێکی وت بڵێین باشە، جارجاریش دەبێ رای خۆمان دەرببڕین. پێنجەم دەبێ پەیوەندیشمان لەگەڵ کۆمەڵگای ئەمریکا زیاد بکەین، تەنها هەر ئیدارەیش نیە، تەنها هەر ئەوە نییە تو بچی لەوێ حکوومەت ببینی، کۆنگرێس گرنگە، رۆژنامەنووس گرنگە، کۆمەڵگا گرنگە، رێکخراوەکان گرنگن، هەر یەکێ حیسابی تایبەتی خۆی هەیە، دەبێ لە هەموو ئاستیکدا لۆبی بکەین. ئەمە پرۆسەیەکی درێژە، دەبێ هەوڵی بۆ بدەین بە پێی توانا، دەبێ ئەم رەوتە بەردەوام بێ، بمانەوێ و نەمانەوێ وایە چونکە بە بەراورد لەگەڵ کێشەی تورکیا یا عێراق یا ئێران کێشەکەی ئێمە بچووکترە ، وەک نەتەوەش حیسابمان بۆ نەکراوە، لە بەر ئەوە دەبێ هەوڵ بدەین و لەم پەیوەندییەدا بەردەوام بین لە هەوڵ و تەقەلاکانمان.

سوپاس بۆ وریا رەحمانی کە هەستاوە بە ئامادەکردنی ئەم کتێبە ، هیوای سەرکەوتنی بۆ دەخوازم.

## پێشەکی- پروفیسۆر مایکێل گەنتەر

تێوەگلانی ئەمریکا لە کوردستان دەگەڕێتەوە بۆ جەنگی جیهانی یەکەم و راگەیاندنە بەناوبانگەکەی وودرۆ ویلسۆنی سەرۆک کۆماری ئەمریکا کە خاڵی ١٢یەمی پەیوەندی بە بەڵێنی خودموختاری بۆ نەتەوەکانی دیکەی ئیمپراتۆری عوسمانیەوە هەبوو کە کەوتبوونە ژێر دەسەلاتی تورکیا. بەلام خەباتی سەرکەوتووی کەمالیستەکانی تورکیا بۆ راگرتنی یەکپارچەیی خاکەکەیان و بڕیاری بریتانیا بۆ راگرتنی کۆنترۆڵی خۆی بەسەر ناوچەی دەوڵەمەند بەنەوتی کوردەکان کە پاشان بوو بە باکووری عێراق، هیوای نیوەچڵی کوردەکانی بۆ گەیشتن بە سەربەخۆیی یان تەنانەت جۆرێک خودموختاری لەناو برد. کەوابوو یەکەم قۆناخی کورتی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا بەنیسبەت کوردەکان کۆتایی پێهات.

زیاتر لە نیو سەدە دواتر ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دیسان کەوتەوە ناو کێشەی کوردەکان، بەلام بەهۆی هاوپەیمانی ناتۆ، ئەمریکا پشتیوانی لە هەڵوێستی دەوڵەتی تورکیا بەنیسبەت کێشەی کورد کرد واتا ئەوە کە کوردەکان لە مافی کەمینەکانی دیکە بێبەش بکرێن بۆ ئەوەی داوای مافی زیاتر نەکەن کە ببێتە هەڕەشە بۆ یەکپارچەیی خاکی تورکیا.

بەهەرحاڵ ویلایەتە یەکگرتوەکانی ئەمریکا لەسەر بنەمای کۆمەڵێک هۆکار شۆڕشەکەی مەلا مستەفا بارزانی لەسەرەتای

دەیـەی ١٩٧٠ لــە عێـراق هانـدا و ئــەم قۆنـاخی دووەمــی پـەیوەندیـەکـانی ئامریکـا و کـوردەکـان بـە نـسکۆی شۆڕشـی ئـەیلوول لـە ١٩٧٥ کۆتایی پێهات .

قۆناخی سێیەمی پەیوەندی ئەمریکا و کوردەکـان لـە دەیـەی ١٩٩٠ بـە شـەڕی ئـەمریکـا لـە کـەنـداوی فـارس دژی سـەدام حوسـەیـن دەسـتی پێکـرد. ئـەمریکـا زۆرتـر چـاوی بڕیبـوە کـوردەکـان چونکـە کـوردەکـان دژی دژمنـی ئامریکـا واتـا دەوڵەتی عێراق بوون. ئەو کاتە ئامریکا تەنانەت کوردەکـانی عێراقـی تـەشـویق کـرد حکوومـەتـی هـەرێمـی کوردسـتان دابمەزرێنن. ئەمە کەم کەم بوو بە قۆناخی چوارەم و قۆنـاخی ئێستای پەیوەندیەکانی ئامریکا و کوردەکان.

کاتێـک کـە ویلایـەتە یـەکگرتـوەکـانی ئـەمریکـا بـۆ لـەسـەردەسـەڵات لابردنـی سـەدام حوسـەیـن لـەسـالی ٢٠٠٣ شـەڕی کـرد، بـەهـۆی ئـەوەی تورکیـە لـەم هـەوڵـەی ئامریکـادا بـەشداری نـەکـرد، کـوردەکـانی عێـراق بـوون بـەهاوپـەیمـانـی سەرەکی ئامریکـا لـە بـەرەی بـاکووری وڵات و بـەسـەرکـەوتنـی ئامریکـا، کـوردەکـانی عێـراق قـازانجی زۆریـان دەسکەوت و ئێستا لـە سـەرکەوتووترین قۆناخی مێژوی هاوچـەرخی خۆیان چێژ وەردەگرن .

ئێـستاش ویلایـەتە یەکگرتووەکـانی ئـەمریکـا لە راستییدا هیـچ ستراتیژییەکی تـۆکمەی بـۆ کـورد وەکـو نـەتـەوەیەک نییە چـونکە ئەو وڵاتـانە کە کـورد تێیانـدا دەژی (تورکیـا، عێـراق، ئێـران و سـوریا) بـۆ سیاسـەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکـان گرنگترن. کوردەکان گیروگرفت بۆ وڵاتە یەکگرتووەکان دروست

دەکەن لە کاتی مامەڵەکردنی وڵاتە یەکگرتووەکان لەگەڵ ئەم دەوڵەتە گرنگترانەدا. لەگەڵ ئەمەشدا وڵاتە یەکگرتووەکان بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیەکانی خۆی لە پەیوەندی لەگەڵ سەقامگیری رۆژئاوای ناوەڕاست و هەروەها مافی مرۆڤ، ئەوەی قبول کردووە کە بەرپرسیارە لە بەرامبەر ئەوەی کوردەکان تا رادەیەک بپارێزێت. ئەم مەسەلەیە بە تایبەت لە عێراق وەراست دەگەرێت چونکە بینیمان چۆن کوردەکانی عێراق پشتیوانیان لە وڵاتە یەکگرتووەکان کرد لە کاتی شەڕ دژی سەدام حوسەین لە ٢٠٠٣ لە کاتیکدا کە هێزەکانی دیکە وەک تورکیا پشتیوانیان لێنەکرد.

وڵاتە یەکگرتووەکان دژی سەربەخۆیی کوردەکانی عێراقە چونکە هەست دەکات دەبێتە هۆی پارچەپارچەبوون و لەناوچونی عێراق و کەوابوو دەبێتە هۆی ناسەقامگیربوونی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست. هەڵوێستی وڵاتە یەکگرتووەکان لە بەرامبەر سەربەخۆیی کورد لە ئێستادا توندوتۆڵترە، چونکە تورکیا و دەوڵەتە جوراوجورە عەرەبەکان هەموویان دژی سەربەخۆیی کوردن، چونکە وەک هەڕەشەیەک لە سەر یەکپارچەیی خاکی خۆیان سەیری دەکەن.

وڵاتە یەکگرتووەکان وەکو تاقیکاری پشتیوانی لە حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکات وەک رێگایەک بۆ راگرتنی یەکگرتوویی سیاسی عێراق و رازیکردنی کوردەکان. گەلێ لە چاودێران پیداگری لە سەر ئەوە دەکەن کە کوردەکانی عێراق ئەمریکاییەکانیان زۆر خۆش دەوێت. بە هەرحاڵ نابێت لەم مەسەلەیەدا زیادەڕۆیی بکرێت چونکە کوردەکان لەبیریان

دێت پێشتر ٢ جار لە ساڵی ١٩٧٥ و دیسان لە١٩٩١ وڵاتە یەکگرتووەکان خیانەتی پێکردن و لەوانەشە دیسان خیانەتیان پێبکاتەوە.

لە راستیدا ترسی هەندێ لە کوردەکان لە دووپاتبوونەوەی ئەم مەسەلەیە کاتێ دەستی پێکرد کە راپۆرتی گروپی توێژینەوەی عێراق(بەیکێر هامیلتۆن) لە دسامبری ٢٠٠٦دا پێشنیاری ئەوەی کرد کە حکومەتی فیدراڵی کوردستان کە کورد بەو هەموو زەحمەتییە بە دەستی هێناوە ببێت بە قوربانی دامەزراندنی حکومەتێکی ناوەندیی سەرلەنوێ دروستکراو. خۆشبەختانە (بۆ کوردەکان) موچیارییەکانی ئەم راپۆرتە لە لایەن دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکانەوە قبوڵ نەکرا بەلام ئەم راپۆرتە خۆی لە خۆیدا نیشان دەدات کە پشتیوانی وڵاتە یەکگرتووەکان لە کوردەکان لە داهاتودا چەندە دەتوانێت لەرزۆک بێت. لە لایەکی دیکەوە وەزیری دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکان، رۆبێرت گەیتس ئەوەی پشتڕاست کردوەتەوە کە هاوکاریی کورد زۆر زۆر پێویستە بۆ جێبەجێکردنی سەرکەوتوانەی ئاسایش و رێکەوتننامە ئیستراتژیکەکانی نێوان عێراق و وڵاتە یەکگرتووەکان و هۆکاری بنەڕەتییە بۆ پێکهاتنی عێراقێکی یەکگرتوو و ئاشتیخواز. لەوەش گرنگتر ئیدارەی ئۆباما چەند رۆژ پاش ئەوە بە ئاشکرا خۆی بە بەرپرسیار زانی لە بەرامبەر چارەسەرکردنی ناکۆکییەکانی نێوان حکومەتی هەرێمی کوردستان و حکومەتی بەغداد و هەروەها یارمەتیدان بە چارەسەربوونی کێشەی کەرکوک.

ولاَتە یەکگرتووەکان وەکو دوست و هاوپەیمان سەیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکات بەلاَم ئەم هاوپەیمانی و دۆستییە ئەوەندەی تورکیا بۆ ئەمریکا گرنگ نییە، کەوابوو پەیامەکە روونە واتا حکومەتی هەرێمی کوردستان ناتوانێت حیساب لە سەر پشتیوانی ئەمریکا بکات. خۆشبەختانە سیاسەتی دەرەوەی نوێی تورکیا بە نیسبەت دراوسێکانی نیشان دەدات کە تورکیا دەستی کردووە بەوە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان لە روی سیاسیەوە وەک دۆستیک قبولّ بکات نە ئەوە کە وەک هەڕەشەیەکی ئەمنی سەیری بکات (کە پیشتر وا سەیری دەکرد).

بەهەرحالّ روونە کە کێشەی کورد پێگەیەکی ئەوتۆی لە ئاسایشی نەتەوەیی ویلاَیە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و رەوتی بە دیموکراسیکردنی رۆژهەلاَتی ناوەڕاستدا نیە کە ولاَتە یەکگرتووەکان بە دوایدایە.

بە هیوای سەرکەوتنی وریا رەحمانی لە کار و لێکۆلّینەوەکانیدا.

## پێشەکی- نوام چامسکی

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا وەك بەهێزترین دەوڵەت لە جیهاندا، دەوری هەیە لە هەموو کاروباری جیهاندا و بێگومان دەستی هەبووە و دەستیشی هەیە لە کاروباری کوردەکاندا. بۆ نموونە وڵاتە یەکگرتووەکان تا ئاستێك پشتیوانی لە راپەڕینی کوردەکان لە عێراق لە سەرەتای دەیەی ۱۹۷۰ کرد بەڵام دوابەدوای مامەڵەی ئێران و عێراق، بزووتنەوەی کوردی فرۆشت و لە ئاکامدا کوردەکان بوون بە قوربانی و کاتێ کە کۆنگرێس رەخنەی لە "هێنری کیسینجێر"ی وەزیری دەرەوە گرت کە بۆ سەرەتا پشتیوانی لە خەباتی کوردەکان کردوە و پاشان (کاتێك کە سوودیان بۆ ئەمریکا نەما) پشتی لێکردن، کیسینجێر قسەیەکی بەناوبانگی کرد کە واتاکەی ئەوەیە کە" کاری سیاسەتی دەرەوە نابێت لەگەڵ کاروباری ئایینی تێکەڵ بکرێت."

ئەمڕۆش ئەم مەسەلەیە بەنیسبەت دەوری وڵاتە یەکگرتووەکان لە کاروباری کوردەکان وەڕاست دەگەڕێت، بەتایبەت لەپەیوەندی لەگەڵ کوردەکانی تورکیا، چونکە دەوڵەتی وڵاتە یەکگرتووەکان لەم دوو دەیەی رابردووەدا بەردەوام پشتیوانی لە سەرکووتی کوردەکان بەدەستی دەوڵەتی تورکیا کردووە کە لە روانگەی منەوە هیچی لە (کۆمەڵکوژییەکەی) کۆزۆڤۆ کەمتر نییە. ئەمریکا بەردەوام رایگەیاندووە لە خەبات دژی تروریزم، دۆست و هاوپەیمانێکی بەتواناتر و باشتر لە تورکیای نییە، چونکە سوپای تورکیا

توانایی خۆی لە هەڵمەتی دژەتیرور لە ناوچەی کوردنشینی باشوری رۆژهەلات سەلماندووە .

مەسەلەی کوردەکانی تورکیا روونترین نموونەی پشتیوانی یەکلاییکەرەوەی ولاتە یەکگرتووەکان لە دەوڵەتییە. ولاتە یەکگرتووەکان زۆرترین چەکۆچۆڵی سەربازی داوە بە تورکیا (لەپاڵ دەوڵەتی ئیسراییل و میسردا) و قەت سەرنجی بە راپۆرتی رێکخراوە نێونەتەوەییەکانی مافی مرۆڤ دەربارەی سەرکووت و تیروری بەردەوامی کوردەکان بە دەستی دەوڵەتی تورکیا نەداوە کە لە ئەنجامیدا ملیۆنەها کورد لە زێدی خۆیان ئاوارە بوونە، چەند هەزار گوند کاول کراون، دەیان هەزار کورد کوژراون و هەموو جۆرە کردەوەیەکی هۆڤانە دژبە کوردەکان بەرێوەچووە کە هەندێکیان لەریزی خراپترین تاوانەکان دژ بە مرۆڤایەتیدان.

ئەم کردەوانەی تورکیا(کە بە پشتیوانی ولاتە یەکگرتووەکان ئەنجام دەدرێت) دەکەوێتە ناو پۆلێنی نێونەتەوەیی-دەوڵەتی. پاکانەی تورکیا بۆ ئەم کردەوە دڵرەقانە ئەوەیە کە ولاتەکەی لەگەڵ مەترسی گریلا کوردە تروریستەکان روبەڕوویە. بەلام کێ تروریستە و کێ دژە ترورە. بە درێژایی مێژوو، سەرکوت بووەتە هۆی بەرخۆدانی و زۆربەی جارانیش ئەم بەرخۆدانییە توندوتیژانە بووە و پاشان سەرکوتکەرەکان ناویان ناوە خەبات دژی تروریزم و بەو لایەنە کە چەوساندوویانەتەوە وتوویانە تروریست. ئەم مەسەلەیە تەنانەت بۆ مرۆڤکوژترین رژیمەکانیش وەراست دەگەرێت، بۆ نموونە دەوڵەتی ئاڵمانیای نازی دەیگوت ئەوە کە ئەوان

دەیکەن بۆ پاراستنی خەڵکە لەبەرامبەر تروریزمی پارتیزانەکان و دەیانگوت دەوڵەتی ڕەوای فەرانسا لە بەرامبەر پارتیزانە تروریستەکان (کە لە دەرەوە ڕێنوێنی دەکرێن و یارمەتی دەدرێن)دەپارێزن. دەوڵەتی ژاپۆنیش لە هەرێمی داکیرکراوی "مەنچووری" چین دەیگوت خەڵك لە بەرامبەر تروریزمی جەردە چینییەکان دەپارێزێت.

تایبەتمەندییەکی گرنگی دیکەی چەمکی تروریزم ئەوەیە کە ئەو شتە کە بە دژە تروریزم دەناسرێت لە لایەن دەوڵەتەکانەوە بەڕێوەدەچێت، دەوڵەتەکان دەیکەن، واتا تروریزمی دەوڵەتییە و دەوڵەتەکانیش کۆمەڵێك سەرچاوەیان لە دەستدایە کە وایان لێدەکات لە هێزە نادەوڵەتییە تروریستەکان توندوتیژتر و کاولکارتر بن. بەردەوام دەگوترێت تروریزم چەکی لایەنە لاوازەکانە، بەڵام بەتەواوی بەپێچەوانەیە، تروریزم هەر وەك هەموو ئامرازەکانی دیکە بە کاریگەرترین شێوە لەلایەن لایەنە بەهێزەکان، بەتایبەت بەهێزترین دەوڵەتەکانەوە بەڕێوەدەچێت .

خەباتی گەلی کورد و ئامانجەکانیان لە تورکیا بۆ ئازادی و مافی مرۆڤ، بۆ خەڵکی دیکەی جیهان ئیلهامبەخشە، چونکە خەباتێکی سروشتی و ڕاستەقینەیە و بە هەستکردن بە بەرپرسیارێتییەوە بەڕێوەدەچێت و نموونەیەکی روونە کە نیشان دەدات مرۆڤ دەتوانێت لە بارودۆخێکی یەکجار دژوار و نالەباردا بەسەر سەرکوت و توندوتیژی دەوڵەتدا زاڵ بێت. لە تورکیا کوردەکان بوێرانە بەرخودانی دەکەن و کار دەکەن بۆ ئاڵوگۆڕ و پێکهاتنی کۆمەڵگایەکی کراوەتر، ئازادتر،

لیبرالتر و دادپەروەرانەتر. کوردەکان لە لایەن گەلێ لە خەڵکی ئازا و بەشەرەفی تورکیاوە پشتیوانیان لێدەکرێت .

کوردەکان تەنها ئەوەیان لە ئێمە دەوێت کە پشتیوانی لە ئامانجە رەوا و بەهەقەکانیان بکەین. واتای ئەم پشتیوانییە ئەوەیە کە ئێمە کۆتایی بێنین بە یارمەتییە یەکلاییکەرەوەکەمان بە سەرکووت و توندوتیژی دەوڵەتی تورکیا دژ بە کوردەکان. لەم چوارچێوەیەدا هیوادارم کوردستانێکی خودموختار دابمەزرێت کە هەموو کوردەکانی ناوچە کە دەیان ملیۆن کەس دەبن، تێیدا بگەن بە مافی خۆبەرێوەبردن و سەربەخۆیی کولتووری خۆیان بەدەست بهێنن و ببن بە بەشێك لە فدراسیونێکی بەرفراوانتر کە لە گروپە ئەتنیکی، نەتەوەیی و کولتوورییەکانی دیکە پێك بێت.

مەسەلەی کورد بە گشتی و کوردەکانی تورکیا بەتایبەتی یەکێ لەو مەسەلانەیە کە جێگای لە دڵمدایە، هەر ئەم هاوسۆزییە لەگەڵ بارودۆخی تراژیدیکی کوردەکانی تورکیایە کە هانیدام سەرەڕای سەرقاڵییەکی یەکجار زۆر وەڵامی ئەرێنی بە داواکارییەکەی وریا رەحمانی بدەمەوە و ئەم چەند خاڵە لەگەڵ ئێوە بهێنمە بەرباس .

## مێژوو و میراتی پشتیوانی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە کورد*
## لوقمان محو - مایکێل نەهمە

یەکگرتوویی کورد هەمیشە وەک هەڕەشەیەک بۆ بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست سەیر کراوە. لە گەرماوگەرمی ئەو پشتوانییە کە ئەمریکا پاش شەڕی ۱۹۹۱ی کەنداو لە کوردەکانی دەکرد، وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا تەنها لە رووی مرۆڤدۆستییەوە سەرنجی بە کوردەکان دەدا و بەرژەوەندی بەبارمەتەگیراوی کوردەکانی بە شێوازێکی راستەقینە بەفەرمی نەدەناسی. وەزارەتی دەرەوەی ئەمریکا کوردەکانی عێراقی بە "کوردە باشەکان" ناوزەد دەکرد و بەئەنقەست و بە ئاگاداربیەوە کوردەکانی ئێران و سوریا و یەکێتی سۆڤیەتی پێشووی پشتگوێ دەخست ، سەرەڕای ئەوەش بەرچەسپی تروریستی دابوو لە کوردەکانی تورکیا.

---

* ئەم پێشەکیە لە کتێبی The Kurdish Question in U.S. Foreign Policy: A Documentary Sourcebook By Lokman I. Meho، Published by Greenwood Publishing Group، USA,2004 وەرگیراوە و ساڵی ۲۰۰۲ واتا پێش لە رەوتی ئازادکردنی عێراق نوسراوە .(وەرگێڕ)

مەبەست لە پاراستنی هەوایی باکووری عێراق لە لایەن ولاتانی رۆژئاوا لاوازکردن و کەمکردنەوەی دەسەلاتی سەدام بوو نە پاراستنی کوردەکان، تورکیاش هەر کاتێ بیویستبایا شالاوێکی بەرفراوانی دەرەوەی سنوری بۆ رەدوونانی کوردە راپەڕیوەکان ئەنجام دەدا. رۆژئاوا(لە سەرویانەوە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا) دەورێکی گرنگی لە کاروباری باکووری عێراق دا بە تورکیا بۆ ئەوەی جێگای دەسەلاتی عێراق بگرێتەوە کە پیش لە ئاداری ۱۹۹۱ زۆر پێویست بوو بەلام پاش ئەوە شەرمەزار کرا.

دەستێوەردانی تورکیا لە کاروباری کوردەکانی عێراق کە رەزامەندی تەواوی **رۆژئاوای لەگەڵ بوو**، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ کاریگەری **پیشوو و بەردەوامی** سیاسەتەکانی سەدام لە نیو گروپ و هاوپەیمانییە جۆراوجۆرەکانی کورددا نەبوو. سیاسەتی تورکیا بە نیسبەت کوردەکانی عێراق (کە لە ژێرەوە لەگەڵ سیاسەتەکانی رژیمی سەدام هاوئاهەنگ کرابوو) یەکێ لە هۆکارە سەرەکییەکانی شەڕ و ناکۆکی ناوخۆ بوو کە بۆ یەکەم جار لە نیسانی ۱۹۹٤ سەری هەلدا.

رۆژئاوا بە ئاشکرا ئەم خالە پشتگوێ دەخات کە بارودۆخی ناوخۆی کوردستان لێکچوونی زۆری هەیە لەگەڵ بارودۆخی زۆربەی کۆمەلگاکانی جیهانی سێیەم کە ئێستا خاوەن ئۆتونۆمین و فاکتۆرگەلی ناتەبا لە نێوانیاندا بەدی دەکرێت و دامەزراوەگەلی شیاویان نییە ، بەلام رۆژئاوا لەم نێوەدا بەردەوام تەنها کوردەکان بە شیاوی ئۆتۆنۆمی نازانێت.

لە رووی سیاسییەوە دو حیزبی سەرەکی لە کوردستانی عێراقدان: پارتی دیموکراتی کوردستان (KDP) و یەکێتی نیشتمانی کوردستان(PUK)، هەروەها کۆمەڵێک حیزبی ناسیونالیستی باڵی راست و حیزبی ئیسلامی و گروپی بچووکی گوندیی دیکەش هەن. خەڵکی کورد رۆژ بە رۆژ لە رووی سیاسییەوە ژیرانەتر بیر لە دەستەواژەگەلێک وەک ئاشتی، دادپەروەری، خۆشبژێوی ئابووری و ئازادی دەکەنەوە و ئێدی متمانەیان بە دەوڵەتە سەرەکییە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکان نییە. ئەم خەڵکە مێژوویەکی دووورودرێژیان لە کوێرەوەری و چەرمەسەری بینیوە. ئەم ئەزموونانە نیشان دەدات کە بەرکەنار لە تاقمچێتی سیاسی و پەخشوبڵاوبوونی کوردەکان لە رووی جوگرافیاییەوە، دەکرێت سیستمێکی تاڕادەیەک هاوئاهەنگ بۆ کوردەکان دروست بکرێت، هەرچەند کە کوردەکان مێژوویەکی دوورودرێژی ناکۆکی ناوخۆیی خوێناویان تێپەڕ کردووە .

سەرەڕای نەبوونی داهاتی راستەقینە یا پشتیوانی دەرەکی و سەرەڕای سەپاندنی دوو گەمارۆ بە سەر کوردستاندا، خەڵکی کوردی عێراق توانیویانە زیندوو بمێنن و تەنانەت لەم دواییانەش توانیویانە خۆیان بەهێز بکەن .

---

* مەبەستی گەمارۆی نەتەوە یەکگرتووەکان لە سەر عێراق بە گشتی و گەمارۆی رژێمی عێراق لە سەر کوردستان پێش لە هێرشی ئەمریکا بۆ عێراق لە ساڵی ٢٠٠٣یە. (وەرگێڕ)

بە هەرحاڵ دەبێ بە وردی سەرنج بە شێوازی پشتیوانی ڕۆژئاوا لە کوردەکان بدەین، چونکە ڕۆژئاوا هەمیشە کاتێک پشتیوانی لە کوردەکان دەکات کە بیەوێت کوردەکان ئامادە بکات تا بکەونە نێو پێکدادانێکی خوێناوی لەگەڵ یەکێ لە هێزە ناوچەییەکان کە سەرەنجام ئاکام و لێکەوتەی تراژدیکی بو کوردەکان بە دواوە دەبێت .

مێژووی کۆن و نوێ بەجاران سەلماندوویەتی کە کوردەکان وەک یەکێ لە ئەکتەرە سەرەکییەکانی سیاسەتی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست لە ڕێگای دژواری خۆیان بۆ گەیشتن بە ئۆتۆنۆمی، بەهۆی ناکۆکی لە نێوان خۆیاندا و دەستێوەردانی هێزە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکان ئاکام و ئەنجامی دڵتەزێنیان دەستکەوتووە. ئەم دەستێوەردانە بووە بە ڕیسا و ڕێوشوێنێک بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی هێزە جۆراوجۆرەکان لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست . هاوپەیمانیی نێونەتەوەیی ۱۹۹۱ کە لە لایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بۆ تێکشکاندنی هێزی سەربازی رەوولە زیادبوونی عێراق لە ناوچە هاوئاهەنگ کرا، بە ئاشکرا کوردەکانی تەشویق کرد لە شەڕ دژی سەدام بەشداری بکەن. پاش تێکشکانی نیوەی سوپای عێراق و چەسپانەوەی سیستمی پاشایەتی لە کوێت، سەرۆک بوش بڕیاریدا لە کاروباری ناوخۆی عێراقدا دەستێوەردان نەکات. ئەم هەڵوێستەی ئەمریکا سەدامی هاندا بە هۆی پشتیوانیکردن لە ئەمریکا لە شەڕی کەنداوی ۱۹۹۱ تۆڵە لە کوردەکان بسێنێتەوە و تێکیان بشکێنێت.

سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا دەبارەی ئۆتۆنۆمی گەلان لەنێو رژیمە سەرکووتکەرەکان بە "ئاژینی نوێی جیهانی* ئالوگۆڕی بە سەردانەهات. وادیارە ئیدارەی ئەمریکا هێشتا باوەڕی بە سیستمێکی نێونەتەوەیی هەیە کە بە تەواوی لە سەر بنەمای یەکپارچەیی دەوڵەت- نەتەوەکان دامەزراوە و رەخنەگرتنی زارەکی تەنها هاوێرێکە(ناوێزە) بۆ کونترولکردنی ئەو دەوڵەتانە کە بەشێوەیەکی دڕەندانە لەگەڵ خەڵکی ولاتی خۆیان رەفتار دەکەن تەنانەت ئەگەر ئەم خەڵکە خۆیان لە گەل بارودۆخی هەنووکە بە نامۆ بزانن.

کاتێک کە جەیمز بەیکێر، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا بارودۆخی یەک میلیون کوردی ئاوارەی لە ناوچە تاوتوێ دەکرد، وتی:

" ئەمڕۆ ئێمە ئێش و ئازار و کوێرەوەری خەڵکی عێراق بەچاو دەبینین". خۆبواردنی "بەیکێر" لە بەکارهێنانی وشەی "کورد" نموونەیەکی روونی هەڵوێستی ئەمریکایە بە نیسبەت کوردەکان.

---

* ئاژینی نوێی جیهانی (New World Order ) ئەو سیستمە سیاسییە جیهانییەیە کە جۆرج بوشی باوک، سەرۆک کۆماری ئەمریکا پاش شەڕی کەنداو رایگەیاند. هەندێ لە پرەنسیپەکانی ئەم سیستمە بریتین لە سەروەری یاسا، دەست نەبردن بۆ توندوتیژی، چارەسەرکردنی ئاشتیخوازانەی ناکۆکییەکان و رێزگرتن لە مافی مرۆڤ بە سەرۆکایەتی ئەمریکا و لە سەر بنەمای نۆرم و شرۆڤەی ئەمریکا. (وەرگێڕ)

لە راستیدا ئەمە شتێکی نوێ نییە لە پەیوەندییەکانی ئەمریکا و کوردەکانی عێراقدا بەتایبەت ئەگەر خولی یەکەمی ئەم پەیوەندییە لە ١٩٧٢-١٩٧٥ وەبیر بهێنینەوە. هینری کیسینجێر*، وەزیری دەرەوەی ئەمریکا پاشان لە کتێبەکەیدا بەناوی "ساڵەکانی کۆشکی سپی لەم پەیوەندییەدا نووسی:

"نیکسۆن (سەرۆک کۆماری ئەمریکا) بەوە رازی بوو شا تەشویق بکات پشتیوانی لە ئۆتۆنۆمی کوردەکانی عێراق بکات. ئەڵبەتە کاروباری کورد و ئاکامە تراژدیکەی لە خولی ١٩٧٢-١٩٧٥ لە چوارچێوەی ئەم کتێبەدا ناگونجێت. من لە بەرگی دووەمی ئەم کتێبەدا ئەم مەسەلەیە شی دەکەمەوە".(بەڵام کیسنجێر لە بەرگی دووەمی کتێبەکەیدا ئەم مەسەلەیەی بە تەواوی پشتگوێ خست).

کیسینجێر لە پەراوێزی ئەم نووسراوانەدا ئەوەی زیاد کرد:

"بڕیاری شا لە ساڵی ١٩٧٥ بۆ چارەسەرکردنی کێشەکەی لەگەڵ عێراق لە سەر بنەمای ئەوهەڵێنجاندنە بوو (کە بەدڵنیاییەوە راستیش بوو) کە کوردەکان لەسەروبەندی بنکەوتندان. شا نەیدەویست هێزە سەربازییەکانی خۆی بخاتە ناو ئەم کێشەیە.... تەنانەت ئەگەر ئێمەش ئوپەراسیونە نهێنییەکەمان خێراتر کردبایا، لەوانەیە کوردەکان ئێمەیان لە بەرامبەر چارەنووسی تراژدیکی خۆیان بە بەرپرسیار زانیبایا".

--------------

* Henry A. Kissinger, *White House Years* (Boston: Little Brown and Company, 1979), pp. 1265-66.

20 ساڵ دواتر کیسینجێر بەشێکی تێروتەسەلی ٢١ لاپەڕەیی دەربارەی کوردەکان نووسی* کە تێیدا رەفتاری ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئامرازە نێونەتەوەییەکەی (CIA) لە گەڵ کوردەکان کە بە ئاگاداری و رەزامەندی خۆی ئەنجام درابوو، دووپات کردەوە. کیسینجێر ئاماژە بەوە دەکات کە:
"تراژیدیای کورد زۆرتر میژوو و جوگرافیا دروستی کردووە بەلآم بەهۆی جیاوازییە نەتەوەییەکانی ئێمە ئەم تراژیدییە زۆرتر بوو. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا سەرەڕای گرنگیدان بە ئۆتۆنومی گەلان، هیچ پەرۆشییەکی بۆ ئۆتۆنۆمی کوردەکان نەبوو".
ئامانجی یەکەمی ئەمریکا لە مانگەکانی کۆتایی شەڕی ١٩٧٢-١٩٧٥ی کوردەکان و عێراق و پاش ئەوە بەهێزترکردنی دەسەلاتی حکوومەتی ناوەندی ئێران و پێشگرتن لە دەستڕۆیشتوویی سۆڤیەت بوو. کوردەکان هەوڵیاندا پشتیوانی هێزەکانی رۆژئاوا بەدەست بهێنن، بەلآم سەرکەوتوو نەبوون. بەهەرحاڵ دەبێ پشتڕاست بکرێتەوە کە کوردەکان بەهۆی هەڵبژاردنی پشتیوانی ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا (کە هیچ بەرژەوەندییەکی ئەوتۆی لە ئامانجی کورددکاندا نەبوو) تەنها کەوتنە ناو گەمەی زلهێزێک و هەڵەیەکی مێژووییان کرد.

---

* Henry A. Kissinger, "Tragedy of the Kurds," in *Years of Renewal* (New York: Simon and Schuster)

کیسنجێر هەروەها دەڵێت:
"ئیستا پاش تێپەڕ بوونی دوو دەیە، من باوەڕم بە کۆمەڵێک ئالٚترناتیڤ هەیە کە ئەو کاتە ئێمە نەمانگرتە بەر" و پاشان دان بەوەدا دەنێت کە:
" ئەڵبەتە بۆ خەڵکی کورد کە قوربانی هەمیشەیی مێژوون، ئەم قسەیەی من دەردێکیان لێ دەوا ناکات."
کیسینجێر ناڕاستەوخۆ ئەوە دەڵێت کە:
"بەهای رزگارکردنی کوردەکان زۆر گران بوو، چونکە پێویستی بە کردنەوەی بەرەیەکی نوێ لە ناوچەیەکی شاخاوی ناگونجاو لە نزیکی سنووری سۆڤیەت دەکرد. کەوابوو مەسەلەی لایەنگری و پشتیوانی لە شەڕێکی وەها (کە لە رووی لوجستیکییەوە زۆر دژوار بوو و زۆر دووردەست بوو و بۆ هاوولاتیانی ئەمریکا دەرکپێکراو نەبوو) لە ئارادا نەبوو. زێدەباری ئەمە شا بڕیاری خۆی دابوو و ئێمە هەڵێنجاندنێکی گونجاومان نەبوو و هیچ ستراتژییەکیشمان نەبوو بۆ ئەوەی شا لە بڕیارەکەی پەشیمان بکەینەوە".
لە درێژەدا کیسینجێر کە ئیستا لە سەر دەسەلات نییە و هەست بە ئازادی دەکات، دەڵێت :
"تراژیدیای کورد وەک بابەتی تاوتوێکردن، کۆمەڵێک فاکتۆرمان دەخاتە بەر دەست تا بگەینە کۆمەڵێک ئەنجامی جۆراوجۆر، لەوانە پێویستبوونی روونکردنەوەی ئامانجەکان هەر لە سەرەتاوە، گرنگبوونی هاوئاهەنگکردنی ئامانجەکان لەگەڵ ئیمکانەکانی بەردەست، پێویستی پێداچوونەی ماوە

بە ماوە لە ئوپەراسیونەکان و پێویستی بوونی پەیوەندی لە نێو هاوپەیمانەکان ."

بە کورتی کوردەکانی عێراق دەوری مۆرەی پلە دوویان بۆ سیاسەتی دەرەوەی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گێڕا. ئەمریکا پاش ئەوەی دوو جار کوردەکانی دژی رژێمی عێراق هاندا، نەیتوانی لە مالوێرانبوون بیانپارێزێت. هەر دوو جارەکە کە ئەمریکا دەستتێوەردانی لە کێشەکە کرد (دەستتێوەردانی نهێنی لە شەڕی ١٩٦١-١٩٧٥ و دەستتێوەردانی ئاشکرا لە شەڕی ١٩٩١) ئامانجی تەنها پاراستنی سەقامگیری نێونەتەوەیی و راگرتنی هاوسەنگی هێز لە ناوچە بوو. ئەم ئامانجەی ئەمریکا چارەنووسی ٣٠ ملیۆن کوردی رەش کردووە کە ٧٥ ساڵە بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی سەربەخۆی خۆی خەبات دەکات.

## مێژووی کورد بە کورتی

کوردەکان خەباتێکی مێژوویی دووروودرێژ و نەپساوەیان کردووە بۆ ئەوەی نەهێڵن شووناسەکەیان بفەوتێت. کوردەکان خاوەن یەکێ لە کۆنترین کۆمەڵگاکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستن کە هێشتا دەوڵەتی خۆیان نییە. بە هۆی ئامادەبوونی بەردەوام بۆ راپەڕین دژی سەرکووتی حکوومەتەکان، کوردەکان بەردەوام لە لایەن هێزە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکانەوە کەڵکیان لێوەرگیراوە بۆ ئەوەی دەوری سەربازی لە ناسەقامگیرکردنی رژیمە ناوچەییەکان بگێڕن.

مێژووی کورد دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی "گووتیەکان"ی کەونار لە نزیکەی چوار هەزار سال لەمەوبەر و وەک خەڵکێک کە رەگوڕیشەی "ئاری"یان هەیە زمانەکەیان سەر بە گرووپی ئێرانی زمانەکانی هیند و ئەوروپاییە و زۆربەیان موسڵمانن. هەر لە کۆنەوە کوردەکان لە ناو سێگۆشەیەکی مێژوویی و ستراتژیک بە پێوەری ٤٠٠ هەزار کیلۆمەتری چوارگۆشەدا ژیاون .

لە ساڵی ١٥١٦ ناوچە کوردنشینەکان لە نێوان ئیمپراتۆری سووننەی عوسمانی و ئیمپراتۆری شیعەی سەفەویدا دابەش بوو. کوردەکان بوون بە پارێزەرانی سنوورەکانی ئەم دوو ئیمپراتۆرییە رکابەرە و توانیان ئۆتۆنۆمییەکی رێژەیی بە دەستبهێنن. پلانی سایکس- پیکۆ* لە ساڵی ١٩١٦ و جێبەجێکرانی پاش جەنگی یەکەمی جیهانی، کوردەکانی پەخشوبڵاو کرد. هەڵسەنگاندنی ژمارەی دانیشتووەکانی کوردستان لە دەیەی ١٩٩٠ نیشان دەدات کە ٣٠ میلیون کورد لە نێوان تورکیا (٥١%)، ئێران(٢٤%)، عێراق(١٦%)، سوریا(٥%)، ئەوروپا (٣%) و یەکێتی سۆڤیەتی پێشوودا(١%) دابەش بوونە.

-----------------

* پەیماننامەی سایکس – پیکۆ ئەو پەیماننامە نهێنییە بوو کە بەریتانیا و فەرانسا ساڵی ١٩١٦ دوابەدوای وتووێژەکانی "سێر مارک سایکس" و "فرانسوا ژرژ پیکۆ" بۆ دابەشکردنی ئیمپراتۆری عوسمانی پاش شەڕی یەکەمی جیهانی دایانرشت.( وەرگێڕ)

پێشتر زۆربەی کوردەکان سەر بە کۆمەڵگا عەشیرەتییەکان بوون و لەرێگای کشتوکاڵ دەژیان و زۆرتر گوێڕایەڵی ئەو ئەمارەتە بچووکانە بوون کە لە لایەن ئاغاکان و (یا) رێبەرە ئایینیەکانەوە بەڕێوە دەچوو.
لە کۆتایی سەدەی ١٩ ناسیونالیزمی کورد مێشکی بژاردە کوردەکانی بە خۆوە سەرقاڵ کرد و پاشان بوو بە هەوڵێکی رومانتیک لە نیو ژمارەیەک لە روشنبیرە شارنشینەکاندا. ناسیونالیزمی کورد وەک رەوتێکی سیاسی نوێ، بوو بە هێزێکی تەیارکەری زیادە بۆ هەتاهەتاییکردنی دەسەڵاتی بژاردە جێکەوتووەکان و یارمەتیدانیان بۆ ئەوەی لە بەرامبەر هەوڵی دەوڵەتی تورکیا، ئێران و عێراق بۆ تواندنەوەی کوردەکان رابوەستن.
کوردەکان وەک کۆمەڵگایەکی ئەتنیکی لانی کەم بە هۆی دوو تایبەتمەندییەوە لەگەڵ هەلاواردن رووبەڕوو بوونەتەوە: کوردەکان لە روانگەی ئێرانییە شیعەکانەوە، سوونەن، لە روانگەی عەرەبەکانەوە، غەیرە عەرەبن و لە روانگەی تورکەکانەوە سەر بە شارستانییەکی ئەتنیکی و رەگەزی جیاوازن. کوردەکان هەست دەکەن لەگەڵ کۆمەڵگاکانی دەوروبەری خۆیان جیاواز و نامۆن. ئەم نامۆبوونە هێزێکی پێبەخشیون تا لە بەرامبەر توانەوەدا رابوەستن. کوردەکان بە هۆی لەیەکجیابوونی ناوچەکانیان و پەراوێزکەوتوویی لە سیستمی نێونەتەوەیی، بە ئاسانی بەتایبەت لە لایەن هێزە سەرەکییەکانەوە بە کارهێنراون.

خەباتی بەردەوامی کورد بۆ هەندێ شێوازی ئۆتۆنۆمی ئەنجامی سروشتیی پێشکەوتنی ژیانەوەی کولتوورییە لە کەشوهەوایەکی ناتەبادا. هەوڵی کوردەکان بۆ بەدەستهێنانی ئۆتۆنۆمی بوو بە ئامرازێک بۆ هەموو ئەو هێزانەی کە بەرژەوندییان لە ناوچەدا هەبوو تا کەڵکیان لێوەربگرن و پیلانیان بۆ دابرێژن، هەر بۆیە کوردەکان زۆربەی جاران وەک داردەستی ئەکتەرانی سیاسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست ناوزەد دەکرێن. لە دەیەی ۱۹۲۰ بریتانیا کوردەکانی فریودا تا دژی تورکیا راپەڕین بکەن بۆ ئەوەی هاوسەنگی نێوان تورکیا و عێراق رابگیردرێت. هەروەها ئەمریکا کۆمەڵێ بەڵێنی خەوشداری دا بە کوردەکان تا دژی عێراق رابوەستن بۆ ئەو ئامانجە کە هاوپەیمانەکەیان واتا شا لە سەروبەندی کێشەکانی ئێران و عێراق لە دەیەی ۱۹۷۰ بەهێز بێت. هاوکات ئێران، عێراق و سوریا لە دژمنایەتییە سیاسییەکانیاندا لە کوردەکان وەک ئامرازێک کەڵکیان وەرگرتووە لە پێناو بەرژەوەندی خۆیاندا. بەهەرحاڵ لە هەموو نموونەکاندا کوردەکان لە بەرامبەر چارەڕەشی خۆیان بە تەنیا هێلراونەتەوە و لەگەڵ تۆڵەی خوێناوی حکوومەتە محەلییەکان رووبەڕوو بوونەتەوە.

**کوردەکان لە عێراقدا**

کێشەی کوردەکانی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ کاتی دامەزرانی حکوومەتی عێراق لە دەیەی ١٩٢٠. حکوومەتی عێراق لە لایەن بریتانیاوە پلانی بۆداڕێژرا کە لە سێ پارێزگا (ویلایەت) پێکدەهات کە هەرکامیان کۆمەڵێ گرووپی ئەتنیکی و تاقمی جیاوازی لەخۆدەگرت: ویلایەتی بەغداد لە ناوەڕاست کە زۆرتر لە عەرەبە سوونەکان پێکدەهات، ویلایەتی مووسڵ لە باکوور کە کوردەکان بە سەریدا زاڵ بوون (و ویلایەتی بەسرە لە باشوور- وەرگێڕ). لکاندنی ناوچەی کوردنشین لە باکوور بە عێراقەوە کە پڕ بوو لە سەرچاوەی سرووشتی، دوو ئامانجی بنەڕەتی بریتانیای دەپێکا: یەکەم ئەوە کە بەم شێوەیە عێراق لە سەر پێی خۆی رادەوەستا و دووەم ئەوە کە خەڵکی کوردی لە یەک جیا دەکردەوە ، کەوابوو ئیمکانی ئەوەی کەم دەکردەوە کە دەوڵەتی نەتەوەیی کورد لە داهاتوودا دروست بێت. ئەم شێوازی دەوڵەتداڕژتنە کە لە زۆربەی وڵاتە تازە سەربەخۆبووەکاندا وەڕاست دەگەڕا، هیچ حیسابێکی بۆ مافی کەمینەکان لە داهاتوودا نەدەکرد و ئەوەی پشتگوێ دەخست کە ئەم سیاسەتە کێشمەکێشی ناوخۆیی لێدەکەوێتەوە. کوردەکان دژی ئەم سیاسەتە راپەڕینیان کرد و داوای ئۆتۆنۆمیان کرد بەڵام بە شێوازێکی دڕندانە لە لایەن بریتانیاوە سەرکووت کران.

هەڵوەشاندنەوەی سیستمی پاشایەتی لە لایەن ژنەراڵ عەبدولکەریم قاسم لە ١٤ی تەمووزی ١٩٥٨ بوو بە خاڵی وەرچەرخان لە چارەنووسی کوردەکانی عێراق و بووە هۆی

بەهێزبوونی بزووتنەوەی ناسیونالسیتی کورد کە زۆرتر لە شەڕی کورد و حکوومەتی عێراق لە ١٩٦١-١٩٧٥ و هەروەها ١٩٩١ ڕەنگی دایەوە کە ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستی لە هەر دوویاندا هەبوو. ئەمریکا دوو ئامانجی سەرەکی لە دەستتێوەردانی ڕاستەوخۆ لەم دوو شەڕەدا هەبوو: یەکەم دەیویست هاوسەنگی هێز لە ناوچە ڕابگرێت و دووەم یارمەتی بدات بە دۆستەکانی واتا شا لە شەڕی یەکەمدا (١٩٦١- ١٩٧٥) و تورکیا و عەرەبستانی سەعوودی لە شەڕی دووەمدا (١٩٩١). هەردوو جارەکە ئەمریکا پەیوەندی لەگەڵ ڕێبەرانی کورد دروست کرد (پەیوەندی نهێنی لە خولی ١٩٧٢-١٩٧٥ و پەیوەندی ئاشکرا لە خولی ١٩٩١) و بەڵێنی پشتیوانی سەربازی دا بە کوردەکان و داواکاری ئۆتۆنۆمی ئەوانی هان دا. ئەم بەڵێنانەی ئەمریکا، ورەی کوردەکانی بەرز کردەوە بۆ ئەوەی بە توندی شەڕ بکەن و لە ئاکامدا دەیان هەزار کەسیان لێکوژرا و بریندار بوو و گوندەکانیان کاول بوو. ئەمریکا هەر دوو جارەکە کاتێ کەڵکی لە کوردە داردەستەکان وەرگرت کە دەوڵەتی عێراق لە رووی سەربازییەوە شێلگیر بوو کوردەکان تێک بشکێنێت. ئەو پرسیارە بێ وەڵامانەی کە لەم پەیوەندییەدا لە ئارادان بریتین لە:

نهێنی پەیوەندییەکانی ئەمریکا و کورد چی بوو؟ ئایا ئەمریکا هەر دوو جارەکە گەیشتە ئامانجەکانی خۆی؟ کوردەکانی عێراق چۆن خزمەتیان بە بەرژەوەندییە سیاسیەکانی ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد؟ ئایا

ئەمریکا هەر لە سەرەتاوە ئاگاداری ئەوە بوو کە ئامانجە درێژخایەنەکانی لەگەڵ ئامانجەکانی کوردەکان یەکناگرێتەوە؟ بۆ کوردەکان لە ١٩٧٥ و ١٩٩١ بە تەنیا هێڵرانەوە و هەرەسیانهێنا. تەنها کاتێک دەتوانین وەڵامی ئەم پرسیارانە بدەینەوە کە چوارچێوەی سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا، ئامانجەکانی، فورمولەکەی، ئامرازەکانی و شێوازی جێبەجێکردنەکەی تاوتوێ بکەین:

**سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا و بزووتنەوە ئۆتۆنۆمیخوازەکان**

سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لە پەیوەندی لەگەڵ ئۆتۆنۆمی لە جیهانی سێیەم و لەوە زیاتر لە پەیوەندی لەگەڵ سەربەخۆخوازەکان چەند لایەنێکی هەیە. ئەم لایەنانە لە هەر دوو بواری سیاسی و ئاکادمیکدا هەتا رادەیەکی زۆر وەڕاست دەگەڕێت. هانس مورگێنسۆ، هێنری کیسینجێر و رئالیستەکان* جەخت لە سەر ئەوە دەکەنەوە کە روانگە زاڵەکانی ئەمریکا بەنیسبەت سیاسەتەکانی جیهانی سێیەم، زۆر بە قازانجی جیهانی سێیەم نەبووەوە و زۆربەی جاران لەگەڵ دژایەتیکردنی بەرچاوی ئامانجی بزووتنەوە ئازادیخوازە نەتەوەییەکان بەرەوڕوو بووەتەوە.

---

* رئالیزم ئەو رێبازە فیکرییەیە کە پەیوەندییەکانی تاک و کۆمەڵگا بەو شێوازە کە لە راستیدا هەیە شرۆڤە دەکات نە بەو شێوازە کە دەبێ هەبێت. لە فەلسەفەی سیاسیدا رئالیستەکان (بە پێچەوانەی مۆراڵیستەکان) پەیوەندییە نێونەتەوەییەکان بە گوێرەی بەرژەوەندی نەتەوەیی و دەسەڵات دادەمەزرێنن و لە سەر ئەو باوەڕەن کە رەفتاری سیاسی دەبێت بە گوێرەی ناسینی واقعبینانەی بارودۆخی ناوخۆیی و نێونەتەوەیی بێت . (وەرگێڕ)

سیاسەتی ئاشکرای ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا هەمیشە ئەوە بووە کە ئۆتۆنۆمی مافی گەلانی بندەستی جیهانە بەڵام بەهەرحاڵ روون نییە ئەم مافە چ کەسانێک دەگرێتەوە. ئەم سیاسەتە قەد لە خزمەت ئامانجی بزووتنەوە رزگاریخوازەکاندا نەبووە، بەڵکوو لە خزمەت بەرژەوەندییە یەکلاییکەرەوە نەتەوەییەکانی ئەمریکادا بووە. ناکۆکی نێوان ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت لە کاتی شەڕی سارد*، ئەمریکای ناچار کرد سیاسەتێکی نهێنی بە نیسبەت هەموو بزووتنەوە نەتەوەییەکانی جیهانی سێیەم و بە تایبەت بەنیسبەت پشتیوانیکردن لە ئۆتۆنۆمی کوردەکانی عێراق بگرێتە بەر. بەهەرحاڵ پاش لەیەکهەڵوەشانەوەی یەکێتی سۆڤیەت، ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەستی کرد بە گرتنەبەری سیاسەتێکی ئاشکرا بە نیسبەت ئەم بزووتنەوانە، بۆ نموونە بزووتنەوەی کوردەکانی عێراق لە سالی ١٩٩١.

---------------

* شەڕی سارد ئەو ململانێ و دوژمنایەتییە سیاسی، ئابووری، سەربازی و ئیدوئولۆژیکیە بوو کە لە نێوان بلۆکی رۆژهەڵات (بە سەرکردایەتی سۆڤیەت) و بلۆکی رۆژئاوا (بە سەرکردایەتی ئەمریکا) لە ئارادابوو بێ ئەوەی دەست ببەن بۆ شەڕی راستەقینە(شەڕی گەرم). شەڕی سارد پاش شەڕی دووەمی جیهانی دەستی پێکرد و پاش لێدوانەکەی کارتێر، سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٨ (و بە باوەڕی هەندێ کەس لە سەرەتای دەیەی ١٩٩٠ بە لەیەک هەڵوەشانەوەی سۆڤیەت) کۆتایی پێهات. (وەرگێڕ)

"ئارنۆلد ولْفێرز" جەخت لە سەر ئەوە دەکاتەوە کە ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کۆمەڵێ پرەنسیپی ناروونی لە سیاسەتی دەورووەی خویدا هەیە. ئەم ناڕوونیە لەگەڵ کەرەستە زۆرە بەردەستەکانی ئەمریکا تیکەڵ بووە و ڕێگای پێداوە بەنیسبەت ئامانجە نەتەوەییەکان توندبێ و بەئاسانی خۆی لەگەڵ هەلومەرجەکەدا بگونجێنێت. رئالیستەکان دەڵێن سیاسەتی دەرەوەی زلهێزەکان تەنها لە ڕێگای تواناییان بۆ گەیشتن بە بەرژەوەندی ئاسایشی نەتەوەیی مەزەندە دەکرێت کە هەندێکیان بریتین لە پاراستن و پشتیوانیکردن لە دۆستان و هاوپەیمانان، راگرتنی هاوسەنگی دەسەڵات لە نێوان دژبەرە جیاجیاکان و پاراستنی هاووڵاتیان لە دەرەوەی وڵات. لە لایەکی دیکەوە مۆرالیستەکان* ڕەخنە لە رئالیستەکان دەگرن کە لە کاتی تاوتوێکردنی ئەم مەسەلەیە کە بڕیارە سیاسیەکان چۆن و بۆ دەربکرێن، لە پلەی دووەمدا گرنگی بە ریسا ئەخلاقییەکان دەدەن.

---

* مۆرالیستەکان (ئەخلاقخوازەکان) ئەو کەسانەن کە پەیڕەوی لەو بۆچوونە دەکەن کە دەبێ ئەخلاق و ڕێوشوێنە ئەخلاقییەکان بە سەر هەموو پرەنسیپەکانی تاک و کۆمەڵگادا زاڵ بێت. لە ئەدەبیاتی سیاسیشدا بەو ڕێبازە فیکریە دەگوترێت کە دەڵێت نابێت بایەخە ئەخلاقیەکان بکرێت بە قوربانی بەرژەوەندی سیاسی. (وەرگێڕ)

هەروەهـا بە بۆچـوونی مۆرالیـستەکان دەسـتەواژەی "بەرژەوەنـدی ئاسایـشی نەتەوەیـی" خـۆی لـە خۆیدا نیشانەی مـامەڵەیەکی خۆخـوازانە و بـێ پرەنـسیپانەیە لە پەیوەنـدییەکانی دەرەوەدا و نیـشاندەری پەیوەنـدی هەمـوو نەتەوەیەکە لەگەڵ بەرژەوەنـدییە ژئۆپلـۆتیکی و ئابووریەکانی، بێ لەبەرچاوگرتنی ئەخـلاق، ماف یان ژیانی نەتەوەکـانی دیـکە. مۆرالیـستەکان رەخـنە لە سیاسـەتی دەرەوی ئەمریکـا دەگـرن کە بەبەهـای پێـشێلکردنی پرەنـسیپەکان بەدوای بەرژەوەنـدییەکانی خۆیـدا دەچێـت و جەخـت لە سـەر ئەوە دەکەنەوە کە ئەم سیاسـەتە بـووەتە هـۆی ئەوەی کە ویلایـە تـە یـەکگرتـووەکـانی ئـەمریکـا رەفتارێکی سیاسی نائەخلاقی هەبێ .

"مورگێنـسۆ" خۆبەرژەوەنـدی وەک ئامـانجی کۆتـایی هەمـوو نەتەوەکـان نـاوزەد دەکـات و زینـدوومانەوە بە بەرزتـرین پرەنـسیپی ئەخلاقـی هەر نەتەوەیەک دادەنێت و جەخـت لە سـەر ئەوە دەکـاتەوە کە دەوڵەت مـافی ئەوەی نیـیە بەرژەوەنـدی نەتەوەیـی خـۆی بـۆ هەنـدێ پرەنـسیپی ئەخلاقـی تـایبەت بخـاتە نـاو مەترسـییەوە و دەڵێـت بەهەرحـاڵ بەرژەونـدی نەتەوەیـی بە سـەر ئەخلاقـدا زاڵە. کەوابـوو ئەو راستییە کە هەمـوو دەوڵەتەکان هەمان ئامانجگەلی سیاسی لە سیاسـەتی دەرەوەی خۆیانـدا پەیـڕەو دەکەن نیـشان دەدات کە ویـستی بەرژەوەنـدیخوازی لە رووی ئەتنیکیـیەوە پاساوهەڵگرە و داواکردنـی ئایدیاڵەکان تەنها خۆڵەناوبردنی لێـدەکەوێتەوە . کێـشەکە ئەوەیە کە ئامـانجگەلێکی وەهـا

بەدینــایەت مەگەر بە بەهــای قوربــانیبوونی بەرژەوەنــدی نەتەوەکــانی دیــکە و هەروەهــا کە "هۆلــستی* ئامــاژەی پێدەکات دەوڵەتەکان بێ لەبەرچاوگرتنی هۆکاری ویژدان، پرستیژ و بەرژەوەنــدی نەتەوەکــانی دیــکە، زۆربەی جــاران پەیوەندییەکانی خۆیان لەگەڵ یەکدی لە سەر بنەمای رێساو رێوشوێنە قبووڵکراوە هاوبەشەکانی کایە دادەمەزرێنن.
بە ســەرهەڵدانی "ئــازینی نــوێی جیهــانی"، گەلــێ گروپــی ئەتنیکی وابیریان دەکردەوە کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئــەمریکــا لەوانەیە رەوتێکــی نــوێ لە سیاســەتی دەرەوەدا بگــرێتەبەر، بەلام بەهەرحــاڵ سیاســەتی دەرەوەی ئەمریکــا بەگشتی هەر وەک رابــردوو دەمارگرژ، پراگماتیک و هەندێ جار بێبەزەییانەیە و ئامازەی پڕ زەرق و بەرقی ئەمریکا بە پرەنسیپەکان بە دوور لە راستییە کە هەندێ لەم پرەنسیپانە بریتین لە دیموکراسی و ئازادی بۆ هەمووو خەڵک، نەمانی برسێتی و هەژاری و دۆستایەتی لەگەڵ هەموو نەتەوەکان.

-----------------

*Holsti

لە سەرەتای دەیەی ١٩٦٠و ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠ سیاسەتمەدارانی ئەمریکا رووبەڕووی کێشەیەکی جیدی بوونەوە و کۆمەڵێک کێشمەکێش لە نێوان سەرۆک کومار و کۆنگرێس لە سەر دەوری هەر کام لەمانە لە دارشتنی سیاسەتی دەرەوە هاتە ئاراوە و سەرۆک کۆمار کەوتە بن کونترۆڵی وەزارەتی دەرەوە، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی (NSC) و ئاژانسی هەواڵگری ناوەندی (CIA). چاودێران ئەم کێشمەکێشە وەک ئاکامی ناکۆکی لەمێژینەی نێوان سیستمی سیاسی دیموکرات و سیستمی ئاسایشی لە خۆبایی نەتەوەیی ناوزەد دەکەن .

ئەم مەسەلەیە لانیکەم هەتا ناوەڕاستی دەیەی ١٩٧٠ وەڕاست دەگەڕا واتا تا ئەو کاتە کە کۆنگرێس کەندوکۆسپی لە سەر هەندێ لە دەسەڵاتەکانی سەرۆک کۆمار دروست کرد. شەڕی ڤییەتنام، مەسەلەی واتێرگەیت* و چالاکی نهێنی نایاسایی ئەمریکا لە جیهانی سێیەم کۆنگرێسی هاندا تا کۆمەڵێک سنوور بۆ ئازادی کاری سەرۆک کۆمار دابنێت.

----------------

واتێرگەیت ئەو ریسواییە سیاسییە بوو کە لە گۆڕەپانی سیاسی ئەمریکا هاتە ئاراوە پاش ئەوە کە کۆمەلێک ئامرازی گوێگرتنی شاراوە لە ناوەندی حیزبی دیموکراتی ئەمریکا (بینای واتێرگەیت) لە کاتی هەڵمەتی هەڵبژاردنەکانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە ساڵی ١٩٧٢ دانرا بۆ ئەوەی ریچارد نیکسۆن دیسان ببێتەوە بە سەرۆک کۆماری ئەمریکا. پاش ئاشکرابوونی ئەم ئۆپەراسیونە چەند کەسێک لە هاوڕێکانی نیکسۆن خرانە بەندیخانە و خودی "نیکسۆن"یش ناچار بوو لە ساڵی ١٩٧٤ دەست لە کار بکێشێتەوە.(وەرگێڕ)

ئەم رەوتە کە کـــۆنگرێس گـــرتیە بەر، بـــۆ پێـــشگرتن لەم رووداوانە زۆر پێویست بوو: یەکەم رووبەڕووبونەوە لەگەڵ ڤییەتنـامێکی دیکە لە رێگـای مـشتومڕی ئاشکرا لە سـەر ئاسایـشی نەتەوەیـی لە بـاتی ئەوەی کە تەنهـا گرووپـی بچووکی دەوروبەرییەکانی سەرۆک کۆمار بڕیاری لەسەر بدەن. دووەم تاوتوێکردنی ئەو دەسەڵاتە یەکجار زۆرە کە لە سەروویدا جەنابی سەرۆک کۆمار راوەستاوە کە هەوڵ دەدات بە هەموو فرتوفێڵێک دەستڕۆیشتوویی کۆنگرێس و دادگاکان کەم بکاتەوە وکاری خۆی بەرەوپێش ببات . سەرۆک کۆمارەکان خۆیان لە سەرووی یاسا دەزانی(بە تایبەت لە کاروباری پەیوەندیدار بە سیاسەتەکانی ئاستی سەرەوە لە سیاسەتی دەرەوە) و بۆ فریودانی کۆنگرێس و بیروڕای گشتی راستییەکانان چەواشە دەکرد.

هەندێ لە ناوچەکانی جیهانی سێیەم ناچار کران دەوری داردەست لە ناکۆکی نێوان رۆژهەڵات و رۆژئاوا بگێڕن. "مایک باوکیر" دەڵێت پەیوەندییەکانی زلهێزەکان لە کۆتایی شەڕی دووەمی جیهانی بەرەو ئەملا، سێ قۆناخی تێپەڕ کردووە: قۆناخی یەکەم ساڵەکانی نێوان ١٩٤٥ و ١٩٦٢-ە کە تێیدا کێشمەکێشی نێوان زلهێزەکان توندتر بوو و تەنانەت ئیمکانی پێکدادانی راستەوخۆ لە نێوان دوو زلهێزەکە لە ئارادا بوو. قۆناخی دووەم ساڵەکانی نێوان ١٩٦٢-١٩٨٩ بوو کە تێیدا پێکەوەژیانی رکابەرانە هاتە ئاراوە و ئاستی پێکدادانی راستەوخۆ لە نێوان دوو زلهێزەکە کەم بووەوە.

ئەم قۆناخە لە کێبەرکێی چەک و تەقەمەنی و ئەو شەڕانەدا ڕەنگی دایەوە کە دەوڵەتەکان بە نوێنەرایەتی لە لایەن زلهێزەکانەوە دەیان کرد.
قۆناخی سێیەم ساڵەکانی پاش ١٩٨٩ـیە کە قۆناخی پێکەوە ژیان لە سەر بنەمای هاوکارییە کە تێیدا سیاسەتی وڵاتە یەکگرتووەگان بە نیسبەت ئۆتۆنۆمی گەلان هەروەک رابردوو ناڕوونە. لەم قۆناخەدا کەشوهەوا بۆ دەستتێوەردان لە کاروباری ناوخۆی وڵاتان (مادام کە لەپێناو بەرژەوەندییە یەکلاییکەرەوەکانی ئەمریکادا بێت) زۆر لەبارە.

"شرویدێر" دەستێوەردان وەک "کەڵکوەرگرتنی بەمەبەست و حیساببۆکراو لە ئامرازگەلی سیاسی، ئابووری و سەربازی لە لایەن ولآتێکەوە بە ئامانجی کاریگەریدانان لە سەر سیاسەتی ناوخۆیی یا دەرەکی ولآتێکی دیکە" پێناسە دەکات. دەستێوەردان دوو شێوازی هەیە: نهێنی و ئاشکرا. بە هۆی ئەوەی کە دەستێوەردانی ویلآیە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە شەڕی ساڵەکانی ١٩٦١-١٩٧٥ی نێوان کوردەکان و حکوومەتی عێراق بە شێوازی نهێنی و نیمچەسەربازی بوو، سەرەتا دەبێ باسی تایبەتمەندییەکانی دەستێوەردانی نهێنی بکەین. CIA دەستێوەردانی نهێنی وەها پێناسە دەکات:

"چالاکییەکی تایبەت کە لە دەرەوەی ولآت و بۆ پشتیوانی لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا پەیڕەو دەکرێت و لە جێبەجێکردنیدا دەوری ئەمریکا نە شاراوەیە و نە بە ئاشکرا پشتڕاست دەکرێتەوە".

لە مەسەلە یەکلاییکەرەوە و زۆر گرنگەکاندا کە پەیوەندی بە ئاسایشی نەتەوەیی ولآتەوە هەیە، CIAراستەوخۆ لەرێگای ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەییەوە راپۆرت دەدات بە سەرۆک کۆمار. یاسای ئاسایشی نەتەوەیی ساڵی ١٩٤٧، پێنج ئەرکی سەرەکی خستووەتە ئەستۆی CIA کە بریتین لە:
یەکەم ئاگادارکردنەوەی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لە بارەی چالاکییەکانی پەیوەندیدار بە ئاسایشی نەتەوەیی. دووەم خستنەڕووی موچیارییەکانی ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی بۆ هاوئاهەنگکردنی ئەم چالاکیانە. سێیەم

هاوئاهەنگی و هەڵسەنگاندن و بڵاو کردنەوەی زانیارییەکان لە ناو حکوومەت. چوارەم خزمەتکردن بە دەزگاکان کە ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی باشتر دەزانێت لە هەمان ناوەنددا ئەنجام بدرێت و پێنجەم ئەنجامدانی کاروبار و ئەرکەکانی پەیوەندیدار بە هەواڵگری کە لەوانەیە کاریگەری لە سەر ئاسایشی نەتەوەیی هەبێت و ئەنجومەنی ئاسایشی نەتەوەیی لەوانەیە جارجار بڕیاریان بۆ دەربکات.

چوار ئەرکی یەکەم تەنها ناوەڕۆکی هەواڵگرییان هەیە، بەڵام ئەرکی پێنجەم لەوانەیە لە ئوپەراسیونی نهێنی و دووردەستدا کەڵکی لێوەربگیردرێت. "دۆکترینی ترومەن* کە بە ئامانجی رێگرتن لە مەترسی کۆمۆنیزم لە ناوچە زۆر گرنگ و یەکلاییکەرەوەکان بۆ ئەمریکا( واتا یونان و تورکیا و وڵاتە تازەپێکهاتوو و تازەسەرهەڵداوەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست) داڕێژرا، گرنگی ئەم پێنج ئەرکەی زیاتر کرد. بەڵام ئەم ئەرکانە چۆن جیبەجێ دەکرێن ؟

------------

* ترومەن، سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە لێدوانێک لە کۆنگرێسدا لە ساڵی ١٩٤٧ خوازیاری ئەوە بوو کە یارمەتی بەو وڵاتانە بدرێ کە لەگەڵ مەترسی کۆمۆنیزم بەرەوڕوون (بەتایبەت تورکیا و یۆنان). ئەو سیاسەتە کە بۆ پێشگرتن لە کۆمۆنیزم لە لایەن ترومەن و سەرۆک کۆمارەکانی دواتری ئەمەریکاوە گیرایە بەر، بە دۆکتورینی ترومەن ناسراوە.(وەرگێڕ)

"جانسۆن" دەڵێت جگە لە ئامرازە کۆنەشۆپەکانی حکومەتەکان، ئەم پێشگرتنە لە ڕێگای ئوپەراسیونی نهێنی CIAش بەڕێوە دەچێت کە بۆ خۆی چەند جۆرە: پڕوپاگەندای سیاسی، پڕوپاگەندای ئابووری و کاروباری نیمچە سەربازی. ئوپەراسیونی نیمچە سەربازیی نهێنی زۆربەی جاران پێویستی بە شەڕگەلی شاراوە و درێژخایەن هەیە. لەم شەڕانەدا دابینکردنی چەک و تەقەمەنی و هەروەها دابینکردنی یارمەتی پێویست بۆ راپەڕیوەکان لە ئەستۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە. لەم ئوپەراسیونەدا راپەڕیوەکان وەک نوێنەری ئەمریکا کار دەکەن و بەم شێوەیە ئەمریکا لە دەستتێوەردانی راستەوخۆ کە پێویستی بە بەهایەکی گرانتر هەیە، دووری دەکات . ئەم مەسەلەیە بۆ خۆی تا ئاستێک جیاوازی و کێشمەکێشی نێوان کۆنگرێس و ئیدارەی سەرۆک کۆمار لە سەروبەندی ئوپەراسیونی نهێنی روون دەکاتەوە. ئەم کێشمەکێشە لە گەڵ دوو هەڵینجاندن رووبەڕوو دەبێتەوە: یەکەم هاوڕابوون لەگەڵ ئوپەراسیونی نهێنی و دووەم دژایەتیکردنی ئوپەراسیونی نهێنی.

لایەنگرانی ئوپەراسیونی نهێنی ئەم پاساوانە دەهێننەوە:

١- یەکێتی سۆڤیەت بە توندی پشتیوانی لە ئوپەراسیونی نهێنی KGB (دەزگای هەواڵگری و سیخۆڕی سۆڤیەت) دەکات

٢ - ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە ئەستۆیەتی پشتیوانی لە هاوپەیمانان و دۆستەکانی بکات و ئەم ئەرکە پێویستی بە ئوپەراسیونی نهێنی بۆ رزگارکردنی دۆستان لە کێشە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکان دەکات.

٣ - لەم ئوپەراسیونانەدا خیرایی و نهێنیپارێزی، شتێکی یەکلاییەکەرەوەیە بۆ سەرکەوتن لە هەلومەرجە هەستیارەکاندا، کەوابوو CIA دەبێ پێش لە هەمووو شتێک رێگەپێدراو بێت کە ئەم مەسەلەیە لە خەڵک بشارێتەوە.
٤- ئوپەراسیونی نهێنی باشترین ئامرازێکە کە لە دەستی حکوومەتدایە بۆ پاراستنی ئاسایشی نەتەوەیی. ئەم ئوپەراسیونە کاتێ کاریگەر دەبێت کە مۆرکی"زانیاری پۆلێنبەندیکراو"(واتا نهێنی) لێبدرێت.

## شەڕی ١٩٦١-١٩٧٥ی کوردەکان و حکوومەتی عێراق

پاش کودیتای **عەبدولکەریم قاسم لە ١٤ی تەموزی** ١٩٥٨ رێبەری ناسراوی **بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد، مەلا مستەفا** بارزانی رێگەی پێدرا پاش ١٣ ساڵ دوورەوڵاتی لە یەکێتی سۆڤیەت بگەڕێتەوە بۆ عێراق. مەلا مستەفا لە بەرامبەر دوژمنەکانی قاسم پشتیوانی لە ناوبراو کرد، لە بەرامبەردا قاسم بەڵێنی ئۆتۆنومییەکی رێژەیی لە چوارچێوەی عێراقی دا بە کورد. قاسم بەڵێنەکەی بەجێ نەگەیاند و هێدی هێدی لەگەڵ راپەڕینی توندوتۆڵی کورد رووبەڕوو بووەوە. لە سەروبەندی ئەم راپەڕینە بەردەوامەدا کە لە ١٩٦١ دەستی پێکرد، بارزانی کۆمەڵێک وتوویژی بگرەوبەردەی لەگەڵ دەسەڵاتدارە یەک لە دوای یەکەکانی عێراق ئەنجام دا و رایگەیاند کۆتایی بە راپەڕینەکە دێنێت ئەگەر ئۆتۆنومییەکی رێژەیی بدرێت بە کورد.
یەکەم رێککەوتنی بارزانی لەگەڵ سەرۆک وەزیرانی عێراق، عەبدولڕەحمان بەزاز لە ١٩٦٥ بوو. بەزاز رایگەیاند

حکوومەت دەیەوێت سیستمێکی ناوەندی یاسایی دابنێت و یەکپارچەیی عێراق بپارێزێت. بەهەرحاڵ شۆڕشی کورد هەتا ناوەڕاستی ١٩٦٦ بەردەوام بوو. لەم قۆناخەدا سوپای عێراق لە هەوڵەکانی بۆ تێکشکاندنی کوردە شۆڕشگێڕەکان هەرەسی هێنا. ئەم سەرنەکەوتنە پرسیاری زۆری هێنایە ئاراوە دەربارەی ئەوەی کە ئایا مەعقولە سەرچاوەی دارایی وڵات بۆ شەڕی بێ کۆتایی لەگەڵ کوردەکان بە فیڕۆ بدرێت.
هەربۆیە بەزاز بەرنامەیەکی ئاشتەوایی ١٤خاڵی پێشنیار کرد کە داواکاریەکانی بارزانی لەپەیوەندی لەگەڵ ئۆتۆنومی رێژەیی بۆ کورد، وەدی دەهێنا. بەڵام بژاردە سەربازییەکانی ناو دەوڵەتی عێراق تۆمەتی خیانەت بە یاسای بنەڕەتییان خستە پاڵ بەزاز و سەرەنجام دەوڵەتی بەزاز کتوپڕ پاش رێککەوتن لەگەڵ کوردەکان رووخا و شۆڕشی کورد پاش بە دەسەڵات گەیشتنەوەی بەعس لە ١٩٦٨ بەردەوام بوو.
حیزبی بەعس لە بنەمادا لە بەرامبەر پاراستنی یەکپارچەیی عێراق دەرووەس بوو، بەڵام بەهرحال چوونکە تازە گەڕابووە سەر دەسەڵات، بەر لە هەموو شتێک ئامانجی ئەوە بوو دەسەڵاتی خۆی پتەو بکات، هەربۆیە بڕیاریدا پەیوەندییەکانی لەگەڵ کوردەکان باشتر بکات و رێککەوتننامەیەکی دوو لایەنەی لە ئاداری ١٩٧٠ لەگەڵ کوردەکان واژۆ کرد کە لەم خاڵانە پێکهاتبوو:
1- قبوڵکردنی زمانی کوردی وەک زمانی فەرمی لەو ناوچانەی کە زۆربەی دانیشتووەکانی کوردن. زمانی کوردی و

عەرەبــــی پــێکەوە لە هەمـــوو قوتابخانەکانــــدا وانەیـــان پێدەگوترێتەوە

2- بەشـــداریکردنی کوردەکـــان لە دەوڵەت، لەوانە دانـــانی کوردەکان لە پۆستە گرنگەکانی وڵات

3 - پەرەپێدانی پەروەردە و کولتووری کوردی

4- پێویستە ئەو کاربەدەستە (غەیرە کوردانە) کە لە ناوچە کوردنشینەکاندا کار دەکەن زمانی کوردی بزانن

5- دامەزرانـــدنی رێکخـــراوی خوێنـــدکاران، جوانـــان، ژنـــان و ماموٚستایانی قوتابخانەکان

6 - گەشەپێدانی ئابووری ناوچە کوردنشینەکان

7- گەڕانەوەی کوردەکـــان بـــۆ گونـــدەکانیان یـــان قەرەبـــووە کردنەوەیان

8 -چاکسازی لە زەوییەکاندا

9- چاکـــسازی لە یاســـای بنەڕەتـــی بە شـــێوەیەک کە بڵێـــت خەڵکی عێراق لە دوو نەتەوەی کورد و عەرەب پێکهاتووە

10- تەسلیمکردنی دەزگاکـــانی رادیـــۆ و چەکـــی قـــورس بە حکوومەت

11- دانانی کوردێک وەک جێگری سەرۆک کۆمار

12 -چاکسازی لە یاسای دابەشکردنی ئیداری بە گوێرەی ئەم راگەیاندننامەیە

13- پێکهـــــاتنی دامەزراوەگەلـــــی ئۆتۆنـــــۆمی لە نـــــاوچە کوردنشینەکان

ئەم رێککەوتننـــــامەیە بەڵێنـــــی بە بـــــارزانی دەدا کە ئەو ناوچـــانەی کە زۆربەی دانیـــشتووەکانی کـــوردن لە مـــاوەی ٤

ساڵ لە کاتێ واژۆکرانی ئەم ڕێککەوتننامەیە ببەن بە خاوەن ئۆتۆنۆمی. بارزانی بەم ڕێگاچارەیە رازی بوو، هەرچەند کە دەیزانی ئەم ڕێککەوتننامەیە بە تەواوی جێبەجێ ناکریت. هێزەکانی بارزانی پاش ٩ ساڵ شەڕی بێوچان ماندوو ببوون و کەوتبوونە ژێر کاریگەری ئەو پڕوپاگەندایە کە حکوومەت دەربارەی ئەم ڕێککەوتننامەیە دەیکرد و بە هۆیەوە ستایشی خۆی دەکرد.

پاش مردنی جەمال عەبدولناسر لە١٩٧٠ و پاشەکشەی بریتانیا لە کەنداوی فارس لە ١٩٧١، ئێران بە توندی دەیویست ئەو بۆشاییەی دەسەڵات پڕ بکاتەوە کە بە هۆی پاشەکشەی بریتانیا لە ناوچە دروست ببوو. ئامانجی یەکەمی ئێران لاوازکردنی عێراق بوو لە رووی ئابووری و سەربازییەوە. ئێرانییەکان هەوڵیاندا کوردەکان هان بدەن تا ئەو پوانانە رەت بکەنەوە کە عێراق پێیدابوون و بەردەوام بۆ بەدەست هینانی پوانی زۆرتر درێژە بە شەڕ بدەن. هاوکات حیزبی بەعس لە عێراق هەوڵی دەدا پاش مەرگی ناسر ببێ بە پێشەوای جیهانی عەرەب و پێش لە باڵادەستی ئێران لە "کەنداوی عەرەبی" بگرێت .

ساڵی ١٩٧٢ رژێمی عێراق بۆ گەیشتن بە ئامانجە زیادەخوازەکانی پەیماننامەی دۆستی و هاوکاری لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت واژۆ کرد، لە بەرامبەردا سۆڤیەت بڕێکی بەرچاو چەکی پێشکەوتووی دا بە عێراق. زیادبوونی دەستڕۆیشتوویی سۆڤیەت لە عێراق و زیادبوونی خەرجە سەربازییەکانی عێراق، ئێران و ئیسراییل و ویلایەتە

یەکگرتووەکانی ئەمریکای نیگەران کرد. ئێران بە مەبەستی تەشویقکردنی کوردەکان بە بەرخۆدانی زیاتر لە بەرامبەر عێراق، پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ کوردەکان پەرەپێدا. بارزانی کە لە کرینی چەکی پێشکەوتوو لە سۆڤیەت لە لایەن عێراقەوە دەترسا و نیگەرانی خیانەتی ئێران لە داهاتوودا بوو، داوای گارانتی نێونەتەوەیی کرد بۆ ئەوەی لە داهاتوودا بە تەنیا نەمێنێتەوە و نەبێتە قوربانی تۆڵەسەندنەوەی عێراق.

کاتێ کە نیکسۆن و کیسینجێر لە ڕێگای گەڕانەوە لە کۆنفرانسێک لەگەڵ برژنێڤ(سەرۆک کۆماری سۆڤیەت) لە مۆسکۆ لە ٣٠ی مایسی ١٩٧٢ سەردانی تارانیان کرد، شا باسی بارودۆخی کوردەکانی بۆ کردن و پێیانی وت کوردەکان متمانەیەکی یەکجار زۆریان بە ئەمریکا هەیە و دەیانەوێت ئەمریکا چەکیان بداتێ. نیکسۆن ئەم داواکارییەی قبووڵ کرد و وتی ئێمە هەموو کارێک بۆ دۆست و هاوپەیمانە وەفادارەکانی خۆمان دەکەین.

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە ریچارد نیکسۆن سەرۆکایەتی دەکرد و خولی سەروک کۆمارییەکەی بە خولی زێڕین ناوزەد کراوە، لەگەڵ هێنری کیسینجێری وەزیری دەرەوە (وەک ڕاوێژکاری ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوەیی) دامودەزگای یارمەتی نهێنی ئەمریکایان بە شەڕی کوردەکان وەگەڕ خست و بارزانی یان لە نیازپاکی خۆیان دڵنیا کردەوە. ئەم شایەتینامەیە پۆڵێنبەندی کرا(واتا مۆری نهێنی لێدرا) و

نیکسۆن لە شوێنی کارەکەی خۆی بردیە دەرەوە چونکە هیچ متمانەیەکی بە بوروکراسی وەزارەتی دەرەوە نەبوو .
مامەڵەی ئەمریکا لەگەڵ کوردەکان لە راستیدا پشتگوێ خستنی ئەو شەرت و مەرجانە بوو کە نیکسۆن و کیسینجێر تۆزی پێش لەوە لە موسکۆ واژۆیان کردبوو. کیسینجێر چەند رۆژ پێش لەوە لە کونفرانسێکی چاپەمەنیدا لە موسکۆ وتبووی:
" ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی سۆڤیەت بە تەواوی هاوڕان لە سەر پێویستی کەمکردنەوەی ئالۆزییەکان لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا و ئامادەن هەرچی پێویستە بیکەن بۆ ئەوەی لەم پەیوەندییەدا بگەن بە رێگاچارەیەک. رێگاچارەیەکی وەها دەتوانێت یارمەتی بدات بە کەمبوونەوەی کێبەرکێی چەک لە ناوچە. من لەلایەن ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکاوە دەتوانم بڵێم کە هەوڵ دەدەین ئەم شەرتومەرجانە بە گوێرەی مەبەستەکانی جێبەجێ بکەین ."
لە راستیدا بە قبولکردنی مامەڵەی ئێران و کوردەکان، نیەتی ئەمریکا بۆ جێبەجێکردنی ئەو شەرتومەرجانە تەنها یەک رۆژی خایاند. دیار بوو نیکسۆن و کیسینجێر بەم هوکارانەی خوارەوە نەیاندەتوانی ئەم مامەڵەیە پشتگوێ بخەن:
١- نیکسۆن و کیسینجێر بە هۆی خۆماڵیبوونی (بەنەتەوەییکردنی) کومپانیای نەوتی عێراق زۆر شڵەژاو بوون.

٢- نیکسۆن و کیسینجێر بەهۆی دەستدرێژییەکانی عێراق لە کەنداوی فارس وەک گوناهبارێک سەیری عێراقیان دەکرد کە بە نوێنەرایەتی سوڤیەت ئەم دەستدرێژییانە ئەنجام دەدات.
٣- کێشمەکێشێکی ناوخۆیی لە عێراق دەیتوانی بواری چەقەکردنی دۆستان و هاوپەیمانانی ئەمریکا بەهێزتر بکات بۆ نموونە دەوری ئێران وەک پۆلیسی کەنداوی فارس و بەرپەرچدانەوەی بانگەشەکانی عێراق لەلایەن کوێتەوە دەربارەی خاکی ئەم وڵاتە و بەهێزتربوونی ئیسرائیل لە هاوسەنگییە سەربازییە ئیستراتژیکەکەی لەگەڵ جیهانی عەرەب.
٤- ئەم مامەڵەیە بەریانە چەپەکانی لە نێو هەندێ لە گروپە کوردەکان لەناو دەبرد.

یارمەتییە ماددی و سەربازییەکانی ئەمریکا بە کوردەکان لە ئابی ١٩٧٢ دەستی پێکرد. CIA بوو بە بەرپرسیاری بەڕێوەبردنی ئەم ئوپەراسیونە ، وەزارەتی دەرەوە هیچ دەستێکی تێدا نەبوو. سەرکردایەتی کورد لەم راستیە بێ خەبەر بوو و وایدەزانی مامەڵە کردن لەگەڵ سەرۆک کۆماری ئەمریکا یانێ مامەڵەکردن لەگەڵ هەموو ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. بارزانی لە ماوەیەکی کورتدا ١٠٠ هەزار پێشمەرگەی دژی هێزەکانی عێراق وەگەڕ خست. لە ماوەی سێ ساڵ پاش ئەوە CIA ملیۆن دۆلاری بۆ کوردەکان خەرج کرد کە زۆر کەمتر بوو لەو برە پارەیە کە بۆ سەرکەوتنی کوردەکان لەم بەربەرەکانییەدا پێویست بوو(٣٠٠ ملێون دۆلار بە وتەی کیسینجێر). شا هەوڵیدا خۆی ئەم کەموکوڕییە قەرەبوو بکاتەوە .

یـــارمەتی ئامریکـــا کەم کەم بـــوو بە شـــتێکی ســـەمبولیک. سەرکردایەتی کورد کە لە شەڕێکی گەورەدا گیری کردبوو، بۆ ئەوەی تەماح بخاتە بەر ئەمریکا و قەناعەتی پێ بهێنێت زیاتر یارمەتییان بدات، چەند جار رایگەیاند:
"جگە لە ئەمریکا، باوەڕی بە هیچ زلهێزێکی دیکە نییە و ئامـــادەیە کوردســـتان ببـــێ بە ئەیـــالەتی پەنجـــاویەکەمی ئەمریکـــا و ســـەرچاوەی نەوتـــی کوردســـتان بکەوێـــتە دەســـتی ئەمریکا و ئەگەر کوردستان (کە لە رووی سەرچاوەی نەوتەوە دەوڵەمەنـــدە) ســـەربەخۆیی بەدەســـت بهێنێـــت، ئەمریکـــا دەتوانێـــت وەک دۆســـتێک لـــە رێکخـــراوی OPEK (وڵاتـــانی نێردەری نەوت بۆ دەرەوە) پشتی پێ ببەستێت".
کوردەکان متمانەی تەواویان بە بەڵێنەکانی ئەمریکا هەبوو و دڵنیـــابوون کە نە ئەمریکـــا و نە شـــا ئەم بەڵێنـــانە پێـــشێل نـــاکەن، بەڵام پاشان بۆیان دەرکەوت کە نە شا و نە سەرۆک کۆمـــار و نە وەزیـــری دەرەوەی ئەمریکـــا نایانەوێـــت کوردەکـــان ســـەر بـــکەون. ئەمـــانە تەنهـــا دەیانەویـــست کوردەکـــان لە بەرامبەر سوپای عێراقدا رابوەستن و درێژە بە شەڕ بدەن و وزە و سەرچاوەکانی وڵاتی عێراق بە فیڕۆ بدەن. راپۆرتێکی CIA لە ٢٢ی ئاداری ١٩٧٤ وەها باسی سیاسەتی دەرەوەی ئێران و ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بە نیسبەت ئەم رەوتە دەکات:
"ئـــێمە ئەوە دەزانـــین کە ئێـــران رازی نیـــیە بە دامەزرانـــی حکـــوومەتێکی کـــوردی کە خـــاوەن ئۆتۆنـــۆمییەکی پێناســـەکراو بێـــت. ئێـــران هەروەک خۆمـــــان قـــــازانجی لەوەدایە کە بـــارودۆخەکە وەک خـــۆی بمێنێـــتەوە و عێـــراق لە ئەنجـــامی پێـــداگری کوردەکـــان لە ســـەر نـــیمچە ئۆتۆنـــۆمییەک بە تەواوی

لاواز بێت. نه ئێمه و نه ئێران نامانەوێت مەسەلەکە بە شێوەیەک لە شێوەکان چارەسەر بێت. ئەم سیاسەتە هەروەها کە لەم راپۆرتەدا ئامازەی پێکراوە بە لایەنی بەرامبەری ئێمە(کوردەکان)کە داوامان لێدەکردن درێژە بە شەڕ بدەن، رانەگەیەندرابوو. ئەم رەفتارە تەنانەت لە چوارچێوەی ئوپەراسیونی نهێنیشدا کارێکی باش نەبوو". تەنانەت "راپۆرتی پایک* (کە لەلایەن گرووپی تویژینەوەی کۆنگرێسەوە ئامادە کرابوو ) لایەنگری لەم هەڵسەنگاندنە دەکرد ، لانیکەم تا ئەو شوێنەی کە پەیوەندی بە سیاسەتی ئەمریکا و ئێران واتا سەرنەکەوتنی کوردەکانەوە هەبوو لایەنگری لەم هەڵسەنگاندنە دەکرد. لە گەرماوگەرمی شەڕی تشرینی یەکەمی ١٩٧٣ی نێوان ئیسراییل و عەرەبەکان، عێراق یەک فەوج سەربازی بۆ بەشداریکردن لەم شەڕەدا رەوانە کرد.

کوردەکان لە سەر داوای ئیسراییل دەیانویست کۆمەڵێک هێرشی بەرچاو بکەنە سەر هێزەکانی عێراق، بەڵام کیسینجێر کە پەی بەوە بردبوو ئەگەر کوردەکان لەم هێرشەدا سەر بکەون.

---

*Pike report

ئەمریکـا تووشـی زیـان دەبێـت ، لە ١٦ی تـشرینی یەکەم فەرمانی بە CIAدا ئەم پەیامە بنێرێت بۆ کوردەکان:
"ئێمە نیازی ئێوە بۆ ئەنجامدانی هێرشی سەربازی کە ئیسراییل پێشنیاری پێکردوون، بە شتێکی باش نازانین".
کوردەکانیش کە متمانەی تەواویان بە ئەمریکا هەبوو، ئەم مۆچیارییەی (کیسینجێر)یان بە قازانجی بێ ئەم لاولای خۆیان لێکدایەوە و قبوڵیان کرد. بەڵام ئەوە سەلمێندرا کە متمانەی کوردەکان بە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا مەترسیدارە. CIAلە تەواوی ئەم ماوەیەدا کۆمەڵێک راستی لە بەر دەستدا بوو دەربارەی ئەوەی کە هەر کاتێک شا لە سەر ناکۆکییەکە سنووریەکەی لەگەڵ عێراق رێک بکەوێت ، بێ گومان دەست لە کوردەکان هەڵدەگرێت.
شا لە سەروبەندی ناکۆکییەکەی لەگەڵ عێراق نە وەک کۆمەڵێک مرۆڤ، بەڵکو وەک ئامرازێک سەیری کوردەکانی دەکرد. CIAش هەمان خوێندنەوەی لە کوردەکان هەبوو و وەک ئامرازێک بۆ لاوازکردنی پێگەی عێراق لە زیادەخوازییە ناوچەییەکانیدا سەیری کوردەکانی دەکرد.
عێراق کە بە هۆی شەڕی کوردەکان لە توانا کەوتبوو و لەوە دەترسا شەڕەکە درێژ بێتەوە، پێشنیاری ئێرانی بۆ وتووێژ لە سەر بەخشینی کۆمەڵێک پوانی سەرزەمینی لە سنووری ئێران و عێراق قبوڵ کرد لە بەرامبەر ئەوەدا کە ئێران پشتیوانی لە کوردەکان رابوەستێنێت. رێکەوتننامەکە لە ٦ی ئاداری ١٩٧٥ لە میانەی کۆنفرانسی OPEK لە ئەلجەزیرە مۆرکرا و دەستبەجێ پاش ئەوە ئێران سنوورەکانی خۆی لە

سەر کوردەکانی عێراق داخست و چەند رۆژ پاش ئەوە سوپای عێراق دەستی بە هێرشێکی بەرفراوان و توند کرد. کوردەکان کە لە لایەن شا و ئەمریکاوە بە تەنیا هێڵرابوونەوە، نەیاندەتوانی لە بەرامبەر دێوەزمەی کوشتوکوشتاری عێراق رابوەستن و هێزی سەربازیان بە ماوەی چەند ساڵ تێکشکا. لە سەروبەندی هێرشەکانی عێراقدا، کوردە ئاوارەبووەکان بە بێهیواییەوە کۆمەڵێک پەیامیان نارد بۆ CIA دەربارەی ئەوەی کە:

"خەلکەکەمان و هێزەکانمان شڵەژاون و تۆقیون. چارەنووسی خەڵکەکەمان لە مەترسییەکی بێ وێنەدایە، لەگەڵ لەناوچونی تەواو بەرەوڕوین، هیچ پاساوێک بۆ ئەم رووداوانە لە ئارادا نییە. ئێمە دەست بە داوێنی ئیوە و دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەبین وەها کە بەڵێنتان پێدابووین، دەستێوەدان بکەن ."

لە پەیامێکی دیکەی کوردەکاندا بۆ کیسینجێر هاتووە:

"جەنابی (کیسینجێر) ئێمە کە هەمیشە لە کێشمەکێش و ناکۆکییەکاندا، لەوانە ناکۆکی ئێران و عێراق باوەڕمان بە رێگاچارەی ئاشتیخوازانە بووە، خۆشحاڵین کە ئێستا ئەم دوو وڵاتە گەیشتوونەتە کۆمەڵێک رێککەوتن ... بەڵام بەهەرحال خوێن لە دڵمان دەتکێت کە یەکێ لە ئاکامە کتوپڕەکانی ئەم رێککەوتنە، لەناوچوونی خەڵکی بێپاراستنی ئێمەیە. هەموو کەسێک بێ دەنگە. جەنابی (کیسینجێر) ئێمە وا هەست دەکەین ئەرکی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکایە کە

داکۆکی لە ئێمە بکات و بەرپرسیاریێتی ئەخلاقی و سیاسی هەیە لە بەرامبەر خەڵکی ئێمە."

بەڵام ئەمریکا هیچ وەڵامێکی راستەوخۆی بە کوردەکان نەدایەوە و هیچ کارێکی بۆ رزگارکردنی ۲۰۰ هەزار خەڵکی ئاوارە ئەنجام نەدا. کاتێ کە کارمەندانی کومیتەی پایک لە بارەی "هەبوونی دەستی ئەمریکا لە چارەڕەشی کوردەکاندا" گفتوگۆیان لەگەڵ کیسینجێر کرد، کیسینجێر لە وەڵامدا وتی: "نابێ ئوپەراسیونی نهێنی لەگەڵ پڕوپاگەندای کاروباری ئاییني تێکەڵ بکرێت."

ئەو قسەیەی "جۆرج لنسۆڤێسکی" بەجێیە کە دەڵێت: "رێککەوتننامەی ئەلجەزایر کە ئەمریکا پێی رازی بوو، بۆ ناسیونالیستە کوردەکان جۆرێک یالتا* بوو". ئەم قسەیە بۆ خۆی ناوەرۆکی چەند بەرگ کتێب لە خۆ دەگرێت.

"ئارتوور تۆرنیر" زۆرتر مەسەلەکە شی دەکاتەوە و دەڵێت: "ریککەوتننامەی ئەلجەزایر کتێبی وانەیەکە کە نیشان دەدات چۆن وڵاتانی گەورە بۆ بەرژەوەندی خۆیان خەڵکی هەژار دەکەن بە قوربانی".

---

* لە ٤-١١ی شوباتی ١٩٤٥ کۆنفرانسێک لە یالتا بەڕیوەچوو کە سەرۆک کۆماری بریتانیا، سۆڤیەت و ئەمریکا تێیدا بەشداریان کرد و کۆمەڵێك شەرتومەرجی گرانیان سەپاند بە سەر ئەو وڵاتانەدا کە شەری جیهانی دووەمیان دۆڕاندبوو، بە تایبەت ئاڵمانیا. مەبەستی نووسەر لێرە ئەوەیە کە پەیماننامەی جەزایر بە هەمان شێوەی کونفرانسی یالتا کۆمەڵێک ئاکامی گرانی بۆ کورد بەدواوە بوو. (وەرگێڕ)

مێژوو لێوانلێوە لە رووداوگەلی سەیروسەمەرە کە هەندێکیان تراژدیک و هەندێکیان خیانەتبارن. دەستبەجێ دوابەدوای ئوپەراسیونی سەربازی لە شوباتی ۱۹۹۱ و هەرەسهێنانی هێزەکانی عێراق، سەرۆک کۆماری ئەمریکا لە بانگەوازێکدا داوای لە خەڵکی عێراق کرد راپەڕن و رژێمی سەدام حوسەین بڕووخێنن. ئەم بەیاننامەیە، ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکای خستە ناو بارودۆخێکی دژواری سیاسی و ئاسایشی ناوچەیی و نێونەتەوەیی کە شۆکێکی ژئۆپلۆتیکی لێکەوتەوە کە هێشتاش کومەڵێک شەپۆلی ناسەقامگیری لە هاوسەنگی هێزەکاندا لە ناوچە دروست کردووە. بەهەرحاڵ هەم کوردەکان لە باکوور و هەم شیعەکان لە باشوور بە گڕوتین و شەوقەوە وەڵامی ئەم داواکاریەی سەرۆک کوماری ئەمریکایان دایاوە. بەڵام لە کاتێکدا کە شیعەکان لە باشوور خۆیان باش نیشان نەدا، کوردەکان بە یارمەتی نەتەوە یەکگرتووەکان و هێزە هاوپەیمانەکان کە بنکەکانیان لە باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا بوو و "ئوپەراسیونی چەکوشی هاوسەنگی"یان بەڕێوە دەبرد، توانیان کیانێکی ئانکلاوی* سەربەخۆی لەرزۆک پێک بێنن.

---

* ئانکلاو بەو کیانە دەڵێن کە لەلایەن دەوڵەتانی دەوروبەرەوە گەمارۆ درابێ یان بە تەواوی کەوتبێتە ناو خاکی وڵاتێکی دیکە. (وەرگێڕ)

بەهەرحاڵ هەروەها کە بوش رایگەیاند، سەقامگیری ناوچە تەنها پاش لەسەر دەسەڵاتنەمانی سەدام حوسەین دەستەبەر دەبوو. بوش هەوڵی دیپلوماتیکی زۆری دا لە ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکان تا توانی بڕیارنامەی ٦٧٨ لە ٢٩ی تشرینی دووەمی ١٩٩١ پەسەند بکرێت. ماددەی ٢ی ئەم بڕیارنامەیە بە ئەنقەست نارِوون دارێژرابوو بۆ ئەوەی شرۆڤە و کردەوەی جۆراوجۆر هەڵبگرێت و رێگای بۆ سەرجەم ئەو دەوڵەتانە کە لەگەڵ کوێت هاوکاریان دەکرد خۆش کرد لە هەموو ئامرازگەلی پێویست بۆ زیندووبوونەوەی ئاشتی و ئاسایشی ناوچە کەڵک وەربگرن.

ئاکام و ئەنجامەکانی بانگەوازە نابەجێکەی بوش نەتەنها نەبووە هۆی لەسەر دەسەڵاتنەمانی سەدام، بەڵکوو بووە هۆی کرانەوەی ئاسۆی دابەشبوونی کۆماری عێراق بە سێ کیانی جیاواز: شیعەکان لە باشوور، سوونەکان لە ناوەڕاست و کوردەکان لە باکوور. ئەم ئاسۆیە هاوسەنگی لەرزۆکی هێزەکانی لە ناوچە لەرزۆکتر کرد. بەهەرحاڵ هەمان ئازموونی کورد و حکوومەتی عێراق لە ١٩٧٢-١٩٧٥ دووپات بووەوە و کوردەکان پاش ئەوەی لە لایەن وڵاتە یەکگرتووەکانەوە هاندران دژی سەدام راپەڕن، بە تەنیا لە بەرامبەر ئاکام و ئەنجامگەلی خوێناوی رووبەڕوو بوونەوە و ئەمریکا هیچ یارمەتییەکی نەدان. بوش کە لەم پەیوەندییەدا تۆمەتی کەمتەرخەمبوونی خرابووە پاڵ بە توورەییەوە وەڵامی دایەوە :

"پێموانییە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گوناهبار بێ لە بەر ئەوەی پێشنیاری ئەوەی بە خەڵکی عێراق کردبێ حکوومەتی عێراق بڕوخێنن و مەبەستی ئەوە بووبێ کە وڵاتە یەکگرتووەکان دێتە مەیدان و پشتیوانی سەربازیان لێدەکات، نا شتی وا راست نییە، ئێمە قەت مەبەستێکی وامان نەبووە ".
پاشەکشەی بەرەبەرەی ئەمریکا لە پشتیوانیکردن لە ئوپوزیسیونی عێراق، یەکەم جار لە لایەن (کالین پاوڵ)ەوە ئاشکرابوو واتا ئەو کاتە کە ئەمریکا هوشداریدا بە سەدام کە لە پەیوەندی لەگەڵ سەرکووتی راپەرینە جۆراوجۆرەکان تۆزێ دەست بپارێزێت (واتای ئەوە کە تۆزی پارێز بکات ئەوە نەبوو کە سەرکووتەکە رابوەستێنێت). پاشان لە ٢٦ی ئادار روون بووەوە کە دەوڵەتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بڕیاریداوە بۆ پشتیوانی لە راپەڕیوان نەیەتە مەیدان. ئەوکاتە فەرماندەی ئەمریکایی هێزە هاوپەیمانەکان، ژنەراڵ "نۆرمەن شوارزکۆف" و هاوتا عێراقییەکەی لە سەر ئەوە رێککەوتبوون کە سوپای عێراق لە کۆپتەری تۆپدار و ئۆتوموبیلی سەربازی بۆ تێکشکاندنی راپەڕین کەڵک وەرنەگرێت .
چەند رۆژ پاش ئەوە هێرشێکی بەرفراوان بۆ سەر کوردە راپەڕیوەکان دەستی پێکرد. شارە سەرەکییەکان کەوتەوە دەستی هێزەکانی دەوڵەت و بە هەزاران کوردی تۆقاو بەرەو شاخەکان هەڵهاتن و بە شڵەژاوییەوە هەوڵیاندا خۆیان لە کۆمەڵکوژی سەدام رزگار بکەن. تا کۆتایی مانگی نیسان پتر لە دوو ملیۆن ئاوارە بەرەو سنوورەکانی ئێران و تورکیا

کۆڕەویان کرد. ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە کێشەی کوێتی چارەسەر کردبوو و هاوسەنگی هێزەکانی لە ناوچە زیندوو کردبووەوە، کێشەیەکی چەند رەهەندی دیکەی دروست کرد کە ئاکام و لێکەوتەی گەورەی بۆ ئاسایشی ناوچە بە دوواوە بوو و هێزە رکابەرەکانی ناوچەی ناچار دەکرد بەربەرەکانی لەگەڵ بکەن.

سەدام بەتوانابیە خێرا و دڕەندەکەی بۆ کۆنترۆلکردنی عێراق و راگرتنی دەسەڵاتی خۆی، جیهانی تووشی سەرسووڕمان کرد. "برێنت سکۆکراقت" لەم پەیوەندییەدا وەڵامی دایەوە:

"ئێمە قەت چاوەڕوانی ئەوەمان نەدەکرد هێرشێکی ئەوەندە توند بکرێتە سەر کوردەکان*."

ئەم کاردانەوە دڕندانەیەی سەدام، ئەنجوومەنی ئاسایشی نەتەوە یەکگرتووەکانی ناچار کرد لە ٥ی نیسانی ١٩٩١ بڕیارنامەی ٦٨٨ پەسەند بکات کە تێیدا سەرکووتی خەڵکی سیڤیلی عێراق بە تایبەت لە ناوچە کوردنشینەکان شەرمەزار کرا و رێگەدرا بەوەی هەرێمێکی ئارام دروست بکرێت کە ئێستا لە کردەوەدا بووە بە کیانێکی جیاواز لە ناو عێراقدا.

---------------

*ئیدارەی ئەمریکا ئاگاداری ئاکامەکانی بە تەنیاهێشتنەوەی کوردەکان بوو و پێشبینی ئەوەی کردبوو کە کوردەکان ئاوارە دەبن، هەربۆیە پێداویستییەکانی ٢٠ هەزار ئاوارەی (واتا ١٠٠ قات کەمتر لە ژمارەی ئەو کەسانە کە لە راستیدا ئاوارە بوون) لە خاکی تورکیا ئامادە کردبوو.

باری یەک ملیۆن ئاوارەی کوردی عێراق کە گەیشتبوونە سەر سنووری ئێران لە سەر شانی ئەم وڵاتە بوو و ئەم ژمارەیە زیاد بوو بە سەر ئەو ٦٠٠ هەزار ئاوارەیە کە لە ئاوارەییەکانی پێشووتردا چووبوونە ئێران. تورکیاش ملیۆنێک کوردی دیکەی وەک ئاوارە قبووڵ کردبوو. تورکیا کە یەکێ لە بەشدارە سەرەکییەکانی شەڕی دووەمی کەنداو بوو و خۆی کێشەی زۆری لەگەڵ کوردەکانی خۆی هەبوو، لە لایەن رۆژئاواوە رێگەی پێدرا دەوری یەکلاییکەرەوە لە ئیدارەی ناوچەی ئالۆزی کوردەکان بگێڕێت. تورکیا هەر لە سەرەتاوە مەنتیقی سیاسەتی درێژخایەنی خۆی بەنیسبەت چۆنیەتی مامەڵە کردن لەگەڵ قەیرانی ئاوارەکان نیشان دا و رایگەیاند ئاوارەکان دەبێ بە زووترین کات خاکی تورکیا بە جێ بهێڵن. ئاوارەکان ناچار بوون خاکی تورکیا بە جێ بهێڵن بەڵام بەهەرحاڵ گەڕانەوە بۆ کیانێکی جیاوازی کورد لە ئارادا نەبوو، بەڵکو دەبوایا گەڕابانەوە بۆ شوێنێکی ئارام لە ناو وڵاتی یەکپارچەی عێراقدا.

لاوازبوونی زیاتری عێراق و دروستبوونی حکوومەتێکی سەربەخۆی کورد هاوسەنگی هێزەکانی بە قازانجی هاوپەیمانیی هەستیاری ئێران و سوریا تێکدەدا. لە ٧ی نیسان، ئوزال سەرۆک کۆماری تورکیا وتی:

"ئێمە ناچارین ئەم خەڵکە(کوردەکان)لە ناو قەڵەمڕەوی عێراقدا بهێڵینەوە و ئاگامان لێیان بێت" (دەستەواژەی قەڵەمڕەوی عێراق دەبێ سەرنجی پێبدرێت). جەیمز بیکەر بوو بە خەمخۆری بەرژەوەندییەکانی تورکیا و بۆ ئەوەی

کوردەکان تێبگەیەنێت ئەمریکا پشتیوانی لە شەڕەکەیان دژی دەوڵەتی عێراق ناکات، لە تورکیا رایگەیاند:
"ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نایەوێت بکەوێتە ناو لێژگەی گیرۆدەبوون بە شەڕی ناوخۆی عێراق"، مەبەستی ئەوە بوو کە بەهەرحاڵ دەوڵەتی درندەی سەدام حوسەین هێشتا دەسەڵاتی یاسایی عێراقە. دامەزراندنی ناوەندگەلی حەسانەوەی نێونەتەوەیی لە خاکی عێراق بێ رەزامەندی حکوومەتی عێراق ، زۆرترین دەستێوەردانێک بوو کە ئەمریکا دەیتوانی دژی یەکپارچەیی وڵاتێک بیکات کە لە ئاستی نێونەتەوەییدا بە فەرمی ناسرا بوو. پاساوی رێزگرتن لە یەکپارچەیی عێراق دەگەڕێتەوە بۆ ئەو پرەنسیپە کە هاوپەیمانان تەنها بۆ ئازادکردنی کوێت ئەو شەڕە قورسەیانە کرد .

**ئەنجام**

بە وتەی "گور- ئاریە" هیچ نەتەوەیک لە سەدەی بیستەم بە قەد کورد نەبووە بە داردەستی هێزە ناوچەیی و جیهانییەکان. سیاسەتی دەرەوی ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەنیسبەت کوردەکانی عێراق بابەتێکی گرنگە کە شرۆڤەی جیاجیا هەڵدەگرێت. دەستێوەردانی ئەمریکا لە کاروباری ناوخۆیی عێراق هەموو توخمەکانی سیاسەتی ماکیاڤیلیستی* لەخۆ دەگرێت . هاندانی کوردەکان لە لایەن ئەمریکا بۆ درێژەپێدانی شەڕ ، دووجار هەموو دەرفەتەکانی لە ناو برد بۆ ئەوەی کوردەکان لە وڵاتی یەکپارچەی عێراقدا بە ئاشتی بژین. ئیدارەی ئەمریکا هەردوو جارەکە(خولی ۱۹۷۲-۱۹۷۵ و خولی ۱۹۹۱) وەک ئامراز سەیری خەڵکی کوردی کرد، بێ لەبەرچاوگرتنی سەرجەم ئەو پرەنسیپە مرۆڤی و ئەخلاقیانە کە سیاسەتی دەرەوەی ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە سەر بنەمای دامەزرابوو. لە ۱۹۷۲-۱۹۷۵ دا بە مەبەستی دڵنیابوون لەوەی کە ئەم ئوپەراسیونە بێ هیچ رەخنە و پرۆتستۆیەک سەردەکەوێت، سەرۆک کۆماری ئەمریکا میکانیزمە چاودێریکارە ئاساییەکانی (کە بۆ ئوپەراسیونێکی هەواڵگریی وەها پێویست بوو) پشتگوێ خست. ئاستی ئەم ئوپەراسیونە لە رادەبەدەر نهێنی بوو. کۆنگرێس، وەزارەتی دەرەوە و تەنانەت باڵوێزی ئەمریکا لە عێراق ئەوەیان رەت دەکردەوە کە ئاگایان لەم پرۆژەیە هەبووبێت.

---------------

* ماکیاڤیلزم رێبازێکی سیاسییە کە لە ناوی ماکیاڤیل، بیرمەندی ئیتالیایی(۱٤٦۹-۱۵۲۷) وەرگیراوە و لە سەر ئەو باوەڕەیە کە مرۆڤ بۆ گەیشتن بە ئامانج دەبێ لە هەموو ئامرازێک کەڵک وەربگرێت وەک خیانەت، پەیمانشکێنی، درۆ، پیلانگێری و هتد . (وەرگێڕ)

سەرۆک کۆمار و وەزیری دەرەوە دڵنیا بوون لەوەی کە بە فەرمی هیچ زانیارییەک دەربارەی پرۆژەکە دزە ناکاتە دەرەوە. ئەم پلانە ئاگای لە سەرەنجامە گرنگ و جیدییەکەی خۆی هەبوو، پلانێک بوو کە لە ڕێگای ڕەوتە جێکەوتووەکانی بڕیاردانی ناو سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکادا نەخرابووە بەرباس و بڕیاری لە سەر نەدرابوو.
هەروەها لە ساڵی ١٩٩١ ئەمریکا نەیتوانی بەڵێنەکانی خۆی بەجێ بێنێت. ورەدانی بوش بە کوردەکان تەنها بۆ ئەوە بوو کە تا ئاستێک بتوانن وەک نەیاری سەدام بمێننەوە نە بۆ ئەوەی کە ئەوەندە بەهێزبن کە بتوانن عێراق دابەش بکەن. ئەم ڕووداوە نێونەتەوەییانەی دوایییە، لە خزمەت بەهێزتر کردنی سیاسەتی ڕئالیستی دەرەوەی ئەمریکادایە. ڕاگرتنی هاوسەنگی دەسەڵات، بیری یەکەم و مەرجی سەرەکی ئەم سیاسەتەیە. بوش زۆر نیگەرانی ئەوە بوو کە هەرچەند کە دەبێ عێراق لاواز بکرێت بەڵام نابێت بە تەواوی وەک وڵات تێکبچێت. لەناوچوونی عێراق هاوسەنگی هێزی لە ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و ناوچەکانی دەوروبەری تێکدەدا. ئەمریکا وا بیری دەکردەوە کە مادام کە هیچ کەس نییە جێگای سەدام بگرێتەوە کە بتوانێت کوردە ڕاپەڕیوەکان لە باکوور و موسڵمانە شیعەکان لە باشوور (کە پێیان باشترە بەشێک بن لە ئێران) کونتروڵ بکات، باشتر هەر ئەوەیە سەدام لە سەر دەسەڵات بێت تا ئەوە کە ئاڵۆزی بە سەر عێراقدا زاڵ بێت و ناوچەکەش ناسەقامگیر بێت. ئەگەر کوردەکان ببن بە بەشێک لە دەرەوی عێراق یا کوردستانێکی

سەربەخۆ دابمەزرێنن،هاوسەنگی لەمیژێنەی هێزەکان تێکدەچێت.
سەرلەشێواوی ئەمریکا بۆ چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ کێشەی عێراق و کوردەکان، گرتنە بەری رێگایەک بە گوێرەی مافی مرۆڤی لە ناو برد. ئەوەی کە لە پەیوەندی لەگەڵ مامەڵەکردن لەگەڵ هەر دوو مەسەلەکە(مەسەلەی عێراق و کوردەکان) روونە ئەوەیە کە بارودۆخی ناوخۆیی و پەیوەندییە ناوخۆییەکانی هێزە جۆراوجۆرە ناوچەییەکان لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست بە وردی حیسابی بۆ دەکرێت. بە کورتی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا بەرژەوەندی یەکلاییکەرەوەی لە ناوچە هەیە کە زۆر گرنگترە لە مافی کەمینەکان و مافی مرۆڤی ئەتنیکەکان.
رێبەرایەتی کورد لە سەرانسەری شۆڕشەکەیدا هیوادار بوو لە رێگای پشتیوانی دەرەکی بگات بە مافی نەتەوەیی خۆی و بەهەرحاڵ پەی بەوە نەدەبرد کە بە نوێنەرایەتی لە لایەن ولاتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی شەڕێکی بە وەکالەت دەکات. گوناهی بەشێک لەم سەرزەنشتانە لە ئەستۆی نەبوونی دووربینی سیاسی نێونەتەوەیی لە نێو کوردەکانە. بێخەبەری رێبەرانی کورد، CIAو ئیدارەی ئەمریکای هاندا لە کێشەی ئالۆزی کورد کەڵک وەربگرن و پاشان وەک لەیزتوکێکی(ئامرازی کایە) بێ کەڵک بیانخەنە لاوە.
بۆ لاپەڕە ناخۆشەکەی دەستتێوەردانی ئەمریکا لە کێشەی نێوان کوردەکان و عێراق دەبێ کێ سەرزەنش بکرێت: CIA یا ئیدارەی سەرۆک کۆمار و یا سیستمی ئەمریکا بە گشتی؟.

بەهەرحاڵ راستییەکی سەرسوورهێنەر کە مرۆڤ دەتوانێت لەم رووداوە دڵسارد‌کەرانە پەی پێ ببات ئەوەیە کە کوردەکان قەت فێری ئەوە نەبوونە خۆیان نەکەن بە داردەستی بەرژەوەندی زلهێزەکان و بەردەوام بە حوکمی ژئوپلوتیکەکەیان* بووونە بە قوربانی هەم وڵاتە یەکگرتووەکان و هەم هاوپەیمانەکانی .

---

* ژئۆپلۆتیک بە واتای سیاسەتی جوگرافیاییە و مەبەست کاریگەری هەڵکەوتی جوگرافیایی لە سەر سیاسەتی ئەو وڵاتەیە . (وەرگێڕ)

**پرسیار: بارودۆخی کورد، بەتایبەت لە هەرێمی کوردستانی عێراق چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

**سین کان:** کوردەکانی عێراق و هەرێمی کوردستان لە ماوەی ٢٠ ساڵی رابردوودا و بە تایبەت لە ساڵی ٢٠٠٣ بەملاوە پیشکەوتنێکی بێ وێنەیان بە خۆ بینیوە. ئێستا عێراق وڵاتێکی فیدراڵە و هەرێمی کوردستان خاوەن ئۆتۆنۆمیەکی زۆرە و خۆی کاروباری خۆی بەرێوە دەبات. کوردەکانی عێراق هەروەها پۆستی زۆر گرنگیان لە دەوڵەت و سوپای عێراقدا بەدەستەوەیە. کەوابوو بەلەبەرچاو گرتنی بارودۆخی نێونەتەوەیی، ئێستا باشترین بارودۆخ بۆ کوردەکانی عێراق رەخساوە .

**مایکیل گەنت:** لە عێراق درووستبوونی هەرێمێکی پارێزراو و خاوەن ئۆتۆنۆمی یارمەتی بە هاتوچۆی خەڵك و ئاڵوگۆری بیروراکان و هاتنی سەرچاوەکان بۆ کوردستانی عێراق داوە و هەمووی ئەمانەش یارمەتییان بە پێشکەوتنی چەمکی خۆدەسەڵاتداری کورد داوە. لە تورکیا دەستراگەیشتن بە رێکخراوەکانی یەکێتی ئەوروپا ، پەیوەندی لەگەڵ تۆری نێونەتەوەیی رێکخراوەکانی مافی مرۆڤی بەهێزتر کردووە و گۆرەپانێکی یاسایی سیاسی نوێی بۆ بانگەشە ناسیونالیستیەکانی کوردەکان دروست کردووە و نەتەنها لە عێراق ، بەڵکو لە ئاستی نێونەتەوەییشدا رەوایەتی بە کوردایەتی داوە.

لە راستیدا لە سەرەتای سەدەی ٢١، ناسیونالیزمی کورد دەستی کرد بە دروستکردنی کێشە و سەرئێشە بۆ داهاتووی دەوڵەتی ئێران، تورکیا، عێراق و سوریا. ناسیونالیزمی کورد بە تایبەت لە باکووری عێراق پاش دروستبوونی دەوڵەتێکی دۆفاکتۆی کورد (کە دوابەدوای شکستی عێراق لە شەڕی کەنداو لە ١٩٩١ پێکهات) بووژاوەتەوە. لە ژێر پاراستنی هەرێمی دژەفڕین کە دژی دەوڵەتی سەدام دامەزرا و تا کاتی رووخانی ئەم رژێمە بەردەوام بوو ، نەوەیەکی کورد لە ژێر دەسەڵاتی ئیدارەی کورددا گەورە بووە کە تەنها زمانی کوردی (نە عەرەبی) دەزانێت. لە مەزیاتر کۆمەڵگای مەدەنی کورد کەم کەم سەری هەڵداوە و گەلێ رۆژنامە، گۆڤار، رادیۆو تەلەڤیزیۆن بە زمانی کوردی کار دەکەن و بیروڕای جیاواز بڵاو دەکەنەوە. کوردەکان چێژ لەو ئازادیانە وەردەگرن کە شوێنەکانی دیکەی عێراق لێیبێبەشن. لەمە زیاتر بوونی دیاسپۆرایەکی تاڕادەیەك خوێندەوار کە رۆژبەرۆژ کاریگەری زیاتری دەبێت و زیاتر لە ٥٠٠ هەزار کەسی لە ئەوروپایە، بووە بە پاڵپشتێك بۆ ناسیونالیزمی کورد کە لە ناو ئەم دەوڵەتە دوفاکتۆیەدا گەشەی کردووە.

شەڕی ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لە عێراق کە سەدام حوسەینی لە ساڵی ٢٠٠٣ لە سەر دەسەڵات لابرد، ناسیونالیزمی کوردی زیاتر لە جاران بەرەوپیش بردووە و لە سایەی دژایەتییە لەمێژینەکانی تورکیا لەگەڵ ئەمریکا، ناسیونالیزمی کورد لە عێراق زۆر زیاتر لەوەی کە چاوەڕوان دەکرا بوو بە هاوپەیمانی نزیکی ئەمریکا. ئەم بارودۆخە

هەستیارە لە ئەنجامی ئەوەدا پێکهات کە تورکیا رێگای بە ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نەدا خاکی ئەو وڵاتە وەك پێگەیەك بۆ هێرشکردنە سەر عێراق لە مارسی ٢٠٠٣ بەکار بێنێت .

کوردەکانی عێراق لەناکاو متمانەیان بە دەوری هاوپەیمانی لەگەڵ ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کرد و بە پەرۆش و سەرکەوتووانە ئەم کارەیان جێبەجێ کرد. لە کاتێکدا کە نائارامییەکانی پاش شەڕی عێراق گەلێك لە ناوچەکانی عەرەبنشینی عێراقی کردووە بە ناوچەگەلی زۆر مەترسیدار، ناوچەی کوردنشینی عێراق بووە بە هەرێمیکی تا رادەیەك ئارام و ناسیونالیزمی کورد بووە بە پشتیوانێکی وەفاداری ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لە بەرامبەردا ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا پشتیوانی لە دەستووری عێراق دەکات کە دەسەڵاتێکی زۆری داوە بە کوردەکان بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان لە عێراقدا.

**مایکێل ئوهانلۆن:** نەتەوەی کورد دەیەوێت بە مافی خۆی بگات و زیندوو بمێنێت و لە رووی دیموکراسیەوە پێش بکەوێت. کوردەکانی عێراق جێگایەکی تایبەتیان لە نێو خەڵکی ئامریکادا هەیە و ئەو ئەمریکاییانە کە شارەزای مێژوون، زۆر بەداخن بۆ ئەو نەهامەتیانە کە لە سەردەمی دەسەڵاتداری سەدامدا بە سەر کورددا هات. جێگای دەسخۆشیە کە کوردەکان نەتەنیا خزمەتی خۆیان دەکان، بەڵکو یارمەتیش بە پێشکەوتنی عێراق دەدەن .

**ئیسماعیل بیشکچی :** لـه ئـهنجـامی دهستێوهردانـی ئـهمریکـا لـه عێراق لـه ئـاداری ۲۰۰۳، لـه ڕووی سیاسـی و کۆمـهڵایـهتییـهوه قۆناخێکی نویٚ بۆ کـوردهکـان دهسـتی پێکـرد. ڕووخـانـی ڕژێمـی سهدام حوسـهین و لـهیهکهـهڵوهشانـهوهی حیزبـی بـهعس و سوپا و ئیـستیخبارات و نـهمـانـی چـهکـه کۆمـهڵکـوژهکـانی سـهدام حوسهین، ڕێگای بۆ کوردهکان کردهوه. کوردهکـانیش بـه باشـی لـهم هـهلـه کـهڵکیـان وهرگـرت. کـوردهکـان بیرۆکـهی عێراقـی فیـدراڵیان خولقانـد و خـستیانه بـواری جێبـهجێکردنـهوه، حکومـهتـی هـهرێمـی ئێـستای کوردستانیش ئـهنجـامی ئـهم قۆناخـه گرنگـهیه.

ئـهمڕۆ کوردسـتانـی باشـور، خـۆی کاروبـاری خـۆی بـهڕێـوه دهبات و ئـهمه بووهته هۆی ئـهوهی کۆمـهڵگـای کـورد لـه بـواری کولتـووری، ئـابووری، کۆمـهڵایـهتـی و سیاسـییهوه پێشکهوتنـی گرنك به خۆوه ببینێت. به بۆچوونـی من جێبهجێبوونـی مـادهی ۱٤۰ ئـهم پێشکهوتنـه بـهتایبـهت لـه بـواری سیاسـییهوه زۆر بهرهو پیشتر دهبات.

لـه تورکیـاش هـهروهها کـه دهبینـین، لـه مـاوهی یـهك سـاڵـی ڕابردوودا کوردهکان دهستکهوتـی زۆریـان بـه دهست هێنـاوه. مـن ئـهو بـاس و گفتۆگۆیـه کـه ئێستا لـه تورکیـا بـۆ چـارهسـهری کێـشهی کـورد لـه ئارادایـه، زۆر گرنـگ دهبینـم. پـارتـی داد و گهشهپێدان (AKP)کردهوهی جیدی بۆ چارهسهربوونـی کێشهی کـورد لـه تورکیـا ئـهنجـام داوه. بـهردهوامبـوونـی ئـهم ڕهوت و گفتۆگۆیـه بـۆ چـارهسـهربـوونی کێشهی کـورد لـه تورکیـا زۆر

گرنگە ، هەرچەند کە ئەم رەوتە یەواشە، بەلاّم بەرەو پێش دەچێت.

بێ گومان داخستنی DTP (پارتی کۆمەڵگای دموکراتیک) کەندو کۆسپ لە سەر رێگای چارەسەر بوونی کێشەی کورد لە تورکیا دروست دەکات. هەروەها گرتن و زیندانیکردنی ئەندامانی حیزبی ئاشتی و دیموکراسی (BDP)و ئەندامانی کۆنگرێسی کۆمەڵگای دیموکراتیک (DTK)و تەنانەت گرتن و زیندانی کردنی منداڵانی کورد زیان بەم رەوتە دەگەیەنێت . لەم پەیوەندییەدا کۆمەڵێك شت هەیە کە ئەرکی حکوومەتە و لە ئەستۆی حکوومەتە کە ئەنجامی بدات . مەسەلەی PKK تەنها لە رێگای گفتوگۆ لەگەڵ بەرپرسانی PKK و BDP چارەسەر دەبێت. سیاسەتی دەوڵەتی تورکیا بۆ لەناوبردنی PKK هەڵەیە و قەدیش شتی وا بۆ دەوڵەتی تورکیا دەست نادات.

دەوڵەتی تورکیا دەیەوێت هێزی پیشمەرگە دژی PKK شەڕ بکات. دەوڵەتی تورکیا بەردەوام داوای ئەمەی لە حکوومەتی هەرێمی کوردستان کردووە و بەردەوامیش دەبێت لە سەر ئەم داواکارییە، بەلاّم حکوومەتی هەرێمی کوردستانیش بەردەوام ئەم داواکارییەی دەوڵەتی تورکیای رەتکردووەتەوە و پێویستە لەمەو بەدواش لە سەر ئەم هەڵویستەی خۆی پێداگری بکات. بە بۆچوونی من حکوومەتی هەرێمی کوردستان پێویستە رێگاچارەیەکی سیاسی و شێوەی جیبەجێوونی ئەم رێگاچارەیە بە دەوڵەتی تورکیا پێشنیار بکات. گەشەکردنی پەیوەندییە بازرگانی و کوولتووریەکانی

نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیاش دەتوانێت بوار بۆ چارەسەربوونی ئاشتیخوازانەی کێشەی کورد لە تورکیا خۆش بکات.

**رابێرت نولسۆن:** بارودۆخی کوردەکان لە تورکیە، ئێستا زۆر لە کاتی دروستبوونی کۆماری تورکیە لە١٩٢٣ باشترە. هۆکاری ئەم مەسەلەیە ئەوەیە کە سپای تورکیە ئیدی ناتوانێت بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بە هێزی چەکداری لەناو ببات یا تێکی بدات یا بەسەریدا زاڵ بێت. خەباتی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیە ئێستا گەیشتوە بە قۆناخێکی سیاسی. پێشهاتەکانی ئەم دوایانە لە تورکیە ئەم مەسەلەیە بە روونی نیشان دەدات. کێشەی دەوڵەتی تورکیە، ئاژانسە هەواڵگریەکان ، سیاسەتی نەتەوەیی و حزبە سیاسیەکان بەتایبەت حزبی دەسەلاتداری AKP ئەوەیە کە لە کۆمەڵێک ئامراز کەڵک وەربگرن بۆ ئەوەی پێش لەو دەستکەوت و پێشکەوتنانە بگرن کە بزووتنەوەی کورد بەدەستی هێناوە. بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیە بەهێزە کەوابوو ئەگەر پەیوەندیەکانی بزووتنەوەی نەتەوەی کورد لە تورکیە و عێراق بەهێزتر بێت و هاوکاریە دوولایەنەکان بەتایبەت لەبواری بازرگانی و پێشکەوتنی ئابووریدا پەرەبسێنێت زۆر باش دەبێت .

داخستنی DTP کەندو کۆسپی جیدی لە سەر سیاسەتی کرانەوە بە روی کورد لە تورکیا دروست دەکات کە دەوڵەتیAKP لە ئابی ٢٠٠٩ دا رایگەیاند. هۆکاری بنەڕەتی

ئەوەی کە دەوڵەتی AKP ئەم سیاسەتەی راگەیاند ئەوە بوو کە دەیویست بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیا لاواز بکات، بە تایبەت بە هۆی ئەوەی کە DTP سرکەوتنێکی زۆر گەورەی لە هەڵبژاردنەکانی ۲۹ ی ئاداردا بە دەست هێنا AKP و حکوومەتی تورکیا پاش ئەوە زانیان کە لە رێگای هێزی سەربازییەوە ناتوانن پێش لە بەهێزبوونی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیا بگرن، هەر بۆیە سەرەڕای جیاوازییەکانی نێوان هێزە چەکدارەکان و AKP کە لە ریسواییەکانی "ئەرگەنەکۆن" و "پیك" دا بە باشی دەرکەوت، دەستیان کرد بە جێبەجێکردنی بەرنامەی کرانەوە بە رووی کورددا بەو ئامانجە کە DTP ، PKK و بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بە گشتی لاواز بکەن. ئامانجی ئەم دەستپێشخەریانە ئەوەیە کە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیا لە چوارچێوەی کۆمەڵێك سیاسەتی پلورالیستیدا پارچە پارچە بکەن بۆ ئەوەی داواکارییەکانی ناسیونالیزمی کورد لاواز بکەن، بە واتایەکی دیکە بۆ ئەوەی بڵێن کە داواکارییەکانی کوردەکان تەنها بەشێکە لەو داواکارییانە کە بە گشتی لە تورکیا لە ئارادایە، کەوابوو لە پلەی یەکەمی گرنگیپێداندا نییە.

**ژۆردی تیژەل:** لەو کاتەوە کە ناسیۆنالیزمی کورد بوو بە خاوەن کیان و هەنگاوێکی گرنگ لە روی نەتەوەسازیەوە هەڵگیرا (کە لە ١٩٩٢ دەستی پێکرد و لە ٢٠٠٣ بەهێزتر بوو) کۆمەڵێک نیگەرانی جددی لە نێو دەوڵەتانی دراوسێ دەربارەی لەدایکبوونی دەوڵەتێکی کوردی کە لەوانەیە سەرجەم کوردەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، بە تایبەت تورکیە لەخۆ بگرێت، سەری هەڵداوە. یاسای بنەڕەتی عێراق سیستمی فیدراڵی قبوڵ کردوە و ئەمەش چڕبوونەوەی کوردەکان هەم لە عێراق و هەم لە سەراسەری رۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەهێزتر دەکات. سەقامگیری وڵاتی عێراق بەبەشداری حزبە کوردەکان لە سیستمی عێراقدا گرێدراوە. لە تورکیا ئەگەر دەستپێشخەریەکان بۆ چارەسەرکردنی کێشەی کورد بە مەبەستی بەئەندامبوون لە یەکێتی ئوروپا جێبەجێ بکرێت ئەو کێشانە کە دەوڵەتی تورکیە بە سەر باکووری عێراقدا سەپاندوویە تا رادەیەک چارەسەر دەبێت. هاوکات بەردەوامبوونی هەوڵەکانی دەوڵەتی تورکیە بۆ دۆزینەوەی رێگاچارەیەکی دیموکراتیک بۆ کێشەی کورد تارادەیەکی زۆر بە بەرەوپێشچوونی مەسەلەی کورد لە عێراق گرێدراوە.

**واین وایت:** بارودۆخی کوردەکانی عێراق زۆر هەستیارە. بارودۆخەکە واحوکم دەکات کە کوردەکان بە پێچەوانەی خواستی بەشەکانی دیکەی عێراق خوازیاری ئۆتۆنۆمی بن و لە ناو فورمولێکی تایبەت لە ناو وڵاتی عێراقدا کە هێشتا بە

تەواوی روون نییە و پێناسە نەکراوە، بمێننەوە. ئەڵبەتە هەڵکەوتی کۆمەڵگای کورد لە عێراق کاریگەری لە سەر دەوڵەتە سەرەکیە نێونەتەوەیەکانی دیکە دادەنێت کە وەک بەشێک لە کێشە سیاسی، ئابووریی و ئەمنیەتیەکانی دیکە سەیری مەسەلەکە دەکەن کە وڵاتی عێراق لە گەڵی رووبەڕوویە، کەوابوو ئەمە بە واتای ئەوەیە کە هەموو وڵاتانی دیکەی ناوچە و جیهان بە شێوەی ناڕاستەوخۆ لەرێگای دەوڵەتی بەغدادەوە لەگەڵ مەسەلەی کوردی عێراق هەڵسوکەوت دەکەن و ئەمەش کۆمەڵێک بەربەستی بۆ کۆمەڵگای کوردی عێراق دروست کردووە، بەڵام دیسان لە گەڵ ئەو بەربەستانە بەراورد ناکرێت کە کۆمەڵگای کورد لە ئێران، تورکیە و سوریە لەگەڵی رووبەڕوویە کە تەنانەت رێگا بەوە نادرێت کوردەکان بە شێوەی فەرمی زمانەکەیان بەکار بهێنن .

**ماریانا شرونتاکی:** کێشەی کورد لە رووی سیاسی و مێژوویەوە هەم لە عێراق و هەم لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرنگە چونکە کوردەکان ٤ هەزار ساڵە لەو ناوچەیە نیشتەجێن و بەهۆی ئەوەی کوردەکان سنووری ٤ وڵاتی ئێران،عێراق ، تورکیە و سوریە پێکدەهێنن، لە ژئۆپۆلۆتیکی ناوچە و جیهاندا دەور دەگێڕن. پێگە و بارودۆخی ئێستای کورد لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی ئەنجام و بەرهەمی نێونەتەوەیبوونی کێشەی کورد و دانوستان لەگەڵ هێزە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکانە. بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد

لە تورکیە بەهێزە و لە چوارچێوەی کۆمەڵێک گرووپی سیاسی جۆراوجۆردا بەرێک خستن کراوە .

ئێستا کوردەکانی عێراق گرنگی زیاتریان بۆ هاوسەنگی هێز لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا پەیدا کردووە، چونکە دەورێکی بنەڕەتیان لە رووخانی سەدامدا بینی و باش لەگەڵ زلهێزەکانی دیکە لە ئاستی سیاسەتی دەرەوە هەڵسوکەوتیان کرد. لەم دواییانە دەوری کورد بۆ ئەمریکا گرنگتر بووە چونکە کوردەکان دەوری یەکلایکەرەوە لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا لە عێراق دەگێڕن لە کاتێکدا کە دەوڵەتانی ناوچە ترسی ئەوەیان لێنیشتوە پارچەکانی کوردستان یەک بگرن و یەکپارچەیی خاکی ئەو وڵاتانە لە ناو بچێت.

**جاناتان رەندیل:** بە بەراورد لەگەڵ ٢٠ و تەنانەت ١٠ ساڵ لەمەو پێش بارودۆخی کوردەکانی عێراق و تورکیا بە شێوەیەکی پەرجوئاسا (وەك موعجیزە) گۆڕاوە. حکومەتەکەی AKP(پارتی داد و گەشەپێدان) لە تورکیا هەوڵی داوە لە دەمارگرژی و زیادەڕۆییەکانی کەمالیستی کەم بکاتەوە، بەڵام "دەوڵەتی سێبەر" هێشتا لە تورکیا توانایی ئەوەی هەیە هەوڵەکانی حکومەتەکەی AKP پووچەڵ بکاتەوە هەروەها کە ئەم دواییانە لە داخستنی پارتە سەرەکییەکەی کوردەکان واتا DTP دا بینیمان.

بە نیسبەت کوردستانی عێراق، کۆمەڵێ پرسیار لە ئارادایە،لەوانە ئایا دوو حیزبە ناسیونالیستە خاوەن رابردووەکە ئامادەن قارەمانێتی خەباتە دوورودرێژەکەیان

لەپێناو مافەکانی کورد بکەن بە بەشێك لە مێژوو ؟ نەوەی نوێی کوردەکان دەیانەوێت پەیوەندییەکانیان لەگەڵ عەرەبەکانی عێراق چۆن دابڕێژن؟.

**توماس نابریسیق** : بارودۆخی کوردەکان هەم لە تورکیا و هەم لە عێراق بەرەوپێشچوونێکی باشی لە دەیەی رابردوودا بە خۆ بینیوە. بە هەرحاڵ ئەم باشبوونە تا رادەیەك لەگەڵ مەترسی رووبەڕوویە. لە تورکیا ترسی ئەوە هەیە کە شەڕی نێوان PKK و دەوڵەتی تورکیا دەست پێبکاتەوە. ئەگەر بارودۆخی کوردەکان لەم دوو وڵاتە بەرەو خراپی بچێت پێشکەوتنە ئابووری و دیموکراتیکەکان لە تورکیا لەگەڵ مەترسی رووبەڕوو دەبێتەوە و لە عێراقێش یەکپارچەیی خاکی عێراق لەگەڵ مەترسی رووبەڕوو دەبێتەوە.

**دانییل سیرڤیر**: بارودۆخی کوردەکان لە تورکیا و عێراق لە راستیدا بە تەواوی جیاوازە. لە عێراق، بە پێچەوانەی تورکیا، بڕیارە ژیرانەکەی رێبەرایەتی کورد بۆ بەشداری تەواو لە حکوومەتی عێراقدا، بووەتە هۆی ئەوەی کوردەکان ئۆتۆنۆمییەکی بەرفراوانیان هەبێت و خۆیان حکوومەتی خۆیان بەڕێوە بەرن و پێگەیەکی بەهێزیان لە بەغداد هەبێت وکاریگەری لە سەر هاوکێشەکان دابنێن. کوردەکان دەستکەوتی زۆریان بەدەست هێناوە، دەوڵەتی خۆیان هەیە، پارلەمانی خۆیان هەیە و سیستمی پەروەردە و خوێندنی خۆیان هەیە و مەسەلەی لەوە گرنگتر ئەوەیە کە بەشێکی

گەورەیان لە دەسەڵاتی بەغداد هەیە . بە بۆچوونی من کوردەکانی عێراق تا ئیستا زۆر باش مامەڵەیان کردووە.

**نۆفرا بینگیو:** بارودۆخی کوردەکانی عێراق و تورکیا زۆر لەیەك جیاوازە. ئەم جیاوازییە لە هەموو بوارە سیاسی، کولتووری و ئابورییەکاندا رەنگی داوەتەوە. کوردەکانی عێراق نەتەنها بۆ کوردەکانی تورکیا، بەڵکو بۆ کوردەکانی ئێران و سوریاش نموونەن. بە هەرحاڵ دەوڵەتی تورکیا دان بە کیانی کورد لە عێراقدا دەنێت، بەلام هێشتا زۆری ماوە بە تەواوی دان بە مافەکانی هاوولاتیانی کوردی خۆیدا بنێت. AKP (حکوومەتی داد و گەشەپێدان) وەك یەکەم هەنگاو سیاسەتی کرانەوەی بە رووی کورد لەم ئاراستەیەدا گرتووەتە بەر، بەلام هێشتا رێگایەکی دوور و درێژ لەم پەیوەندییەدا لە تورکیا ماوە.

**گونەش تەزجور:** بارودۆخی کوردەکان لە عێراق و تورکیا لەم دە ساڵەی دواییەدا بەرەوپێشچوونێکی زۆر گرنگی بە خۆوە بینیوە. کوردەکانی عێراق پاش ئەو هەموو سەرکوت و ئازارە کە بە ماوەی چەندەها ساڵ لە سەر دەستی دەوڵەتی ناوەندی بەغداد بینیان، ئێستا چێژ لە سەقامگیری سیاسی و پێشکەوتنی ئابووری ناوچەکەیان وەردەگرن. هەرچەند کە کوردەکانی تورکیا ئێستاش تا رادەیەك مافەکانیان زەوت دەکرێت، بەلام لەگەڵ ئەمەشدا بواری سیاسی زۆریان بۆ

رەخساوە بۆ ئەوەی شوناسی کولتووری خۆیان بە گشتی دەرببڕن. لەمە زیاتر، لەم دواییانە، لە رووی چەندایەتی و چۆنیەتییەوە پێکدادانە سەربازییەکانی نێوان هێزەکانی ئاسایشی تورکیا و PKK لە چاو سالانی پێشووتر، بە شێوەیەکی بەرچاو کەمی کردووە، بەلام لە هەمان کاتدا کوردەکانی سوریا و ئێران هێشتا لەگەڵ رژێمگەلێك رووبەڕوون کە مافە سیاسی و کولتووریەکانیان بە توندی زەوت دەکات.

**دەیڤید رۆمانۆ:** پێموایە ئەو دەستکەوتانە کە کوردەکانی عێراق و هەروەها کوردەکانی تورکیا بە دەستیان هێناوە، زۆر گرنگن. خۆشبەختانە تازە ئەو سەردەمە بەسەرچوو کە نوخبە سیاسیەکانی ولاتانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بتوانن بانگەشەی ئەوە بکەن کە کورد بوونی نییە. رێژەی بەرهەمە زانستی ، ئەدەبی، میدیایی و هونەرییەکانی کوردەکان گەیشتووەتە ئاستێك کە قەت لەگەڵ ۲۰ ساڵ لەمەو پێشدا بەراورد ناکرێت، ئەم هەلومەرجە زۆر گرنگە بۆ مانەوە و گەشەکردنی شوناسی کورد.

زۆر جێگای دڵخۆشییە کە بینیمان ئەم دواییانە هەڵبژاردن لە هەرێمی کوردستان بەڕێوە چوو و پار لەمان دەست بە کاربوو و پۆستی سەرۆکایەتی حکومەتی هەرێم و پۆستەکانی وەزاری دەست بە دەست بوو. هەرچەند کە هێشتا کاری زۆر ماوە کە لە حکومەتی هەرێمی کوردستاندا بکرێت، بەلام لەرووی دەستبەدەستکردنی دەسەلات، کوردستان لە زۆربەی

دەوڵەتانی ناوچەکە باشترە. ئەگەر کێشەی گەندەڵی بەم زووانە چارەسەر بکرێت (کە خۆشبەختانە حکومەتی نوێی هەرێمی کوردستان دەستپێشخەری کردووە و بە جددییەت بەگژ گەندەڵیدا دەچێت) کاریگەری زۆری دەبێت لەسەر هاندانی دەسەڵاتدارییەکی باش لە ناوچەکە.

**ویلیام بیل:**

کوردەکان لە هەرێمی کوردستانی عێراق، خۆیان حکومەت بەرێوەدەبەن، هەرچەند کە بە تەواوی سەربەخۆ نین و ئەگەر بێت و سەربەخۆیی خویان رابگەیەنن، کۆمەڵگای نێونەتەوەیی هیچ پشتیوانیەکیان لێناکات یا پشتیوانیەکی کەمیان لێدەکات. عەرەبەکانی عێراق ئێستا لە بارودۆخێکدا نین کە لەگەڵ کوردەکان بەربەرەکانی بکەن، بەڵام زەحمەتە لە درێژخایەندا شتی وا قبوڵ بکەن، بەتایبەت کۆمەڵێك ناکۆکی لە نێوان هەولێر و بەغداد لە سەر مەسەلەی نەوت و داهات و کەرکووك هەیە. ئەڵبەتە لە تورکیاش دەوڵەت سیاسەتێکی کراوەی بە نیسبەت مەسەلەی کورد گرتووەتە بەر. حیزبی دەسەڵاتداری AKP (پارتی داد و گەشەپێدان) دەنگدەر و پارلەمانتاری کوردی زۆری هەیە، کەوابوو پێویستی بەوەیە کە کێشەی کورد چارەسەر بکات. هەروەها دەوڵەتی AKP زیاتر لە دەوڵەتانی پێشووتری تورکیا ئامادەیە دەسەڵاتی هێزەکانی ئاسایش لە تورکیا بباتە ژێر پرسیار. بە شێوەیەکی گشتیتر بەنیسبەت مەسەلەی کورد و دەوڵەتی تورکیا بەهەرحاڵ ئەگەری ئەوە زۆر کەمە کە کیانێك وەك حکوومەتی هەرێمی کوردستانی عێراق لە تورکیا

دروست بێت، هەرچەند کە بەهەرحاڵ لەوانەیە دەوڵەتی تورکیا تەحەمولی زیاتر بەنیسبەت کولتووری کورد و سەرمایەگوزاری ئابووری زیاتر لە ناوچەی کوردنشینی تورکیا لە خۆی نیشان بدات. هەروەها حکوومەتی AKP هەوڵ دەدات داخستنی حیزبە سیاسیەکان لە تورکیا لە داهاتوودا زەحمەتتر بکات. بە بۆچوونی من داخستنی حیزبە سیاسیەکان لە داهاتوودا زەحمەتتر دەبێت و ئەمەش زۆر بە قازانجی لایەنە سیاسیە کوردەکان دەبێت لە تورکیا، هەرچەند کە رێگایەگی دوورودرێژ لەم پەیوەندییدا لە پێشە و لەوانەیە لەسەرەتادا ئاڵۆزییەکانی ناوخۆی تورکیا زیاتر بکات. بەڵام سیاسەتی ئانکارا بە نیسبەت کوردەکانی عێراق ئاڵۆزە. تورکیا دەرك بە قازانجە ئابووریەکانی خۆی لە باکووری عێراق دەکات و هەروەها تا رادەیەك لە گرێدراوبوونی سیاسی باکووری عێراق بە تورکیا تێدەگات. تورکیا هیواداره کە لەرێگای نزیکبوونەوە لەگەڵ کوردەکانی عێراق قازانجی سیاسی و ئابووری وەدەست بخات. هەروەها لەوانەیە تورکیا بیر لە پلانی دیکەش بکاتەوە واتا ئەوە کە چی روو دەدات ئەگەر عێراق پارچە پارچە بێت یا بکەوێتە ناو ئاڵۆزی و شەڕی ناوخۆ. بەهەرحاڵ تورکیا بە توندی دژی گەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستانە،لانی کەم لە بارودۆخی ئێستادا.

**کریستینا کۆیگین:** لـه راسـتیدا ئـەو کاتـە کـە کوردسـتان لـە پـەیماننامـەی (لۆزان)دا دابـەش بـوو رەوتـی ژینوسایدی کـورد دەسـتی پێکـرد. پاش ئـەوە کـوردەکـان لـە تورکیـا بـوون بـە کەمینـەیەکـی بـەفـەرمـی نـەناسراو و لـە عێراقیش، سـەرەڕای ئـەوەی کـە وەك کـەمینـە بـە فـەرمـی ناسـران، رێـز لـە مافـە کولتـووری و زمانییـەکـەیـان نـەدەگیـرا. عێـراق و تورکیـا کتـوپڕ پاش ئـەوە دەستیان کرد بـە تاواندنـەوەی زۆرەملـی کـوردەکـان، بـەڵام کوردەکان قبولّیان نـەکرد ببن بـە تـورك و عـەرەب و لـە بـەرامبـەریان راپـەڕینیان کرد. دەولّـەتی تورکیا و عێراقیش بـە زۆر( نـە بـە وتـووێژ و سـازش) وەلاّمـی کـوردەکانیـان دایـەوە. سـەرکوتـی کوردەکان لـە دەیـەی ١٩٢٠تایبـەتمـەندی ژینوسـایدی پێوە دیار بوو، بـەڵام لـە کۆمـەڵکـوژی نـەرمتـر بـوو ، بـۆ نموونـە لـە چوارچێـوەی تاواندنـەوەی کولتـووری و زمانییـدا بـەڕێـوە دەچوو. هێدی هێدی توندوتیژی حکوومـەتـی تورکیا و عێراق لـە بـەرامبـەر کوردەکان لـە تاواندنـەوەی زۆرەملـێ بـۆ شـێوازگـەلـی توندتر واتا دەرکردن و کۆمـەڵکـوژی زیـادی کـرد . بـەهـەرحـاڵ ترۆپکـی رەوتـی ژینوسایدی کـوردەکـان، ئـەنفـالـی سـاڵی ١٩٩٨ بوو .

رافاییل لـەمکین ، دادوەری پۆلـەنـدایی(کـە کنڤانـسیونـی دژە ژینوسـایدی نـەتـەوە یـەکگرتـووەکـان لــە سـەر بنـەمـای بیرۆکـەکـانی ئـەو دامـەزراوە و زیـاتر لـە سـەر هۆلۆکاسـت- ژینوسایدی جولـەکـەکـان لـە کـاتی جـەنگـی دووەمـی جیهـانی- کـاری کـردووە) هـەشـت شـێوەی بـۆ ژینوسـاید دانـاوە: شـێوەی سیاسی، کۆمـەڵایـەتـی ، ئـابووری، بیـۆلـۆژیکـی، فیزیکـی ، ئـایینـی

و ئەخلاقی. بە بۆچوونی من ،سەدام حوسەین لە هەمووی ئەم شێوە ژینوسایدانە(جگە لە ژینوسایدی ئەخلاقی) دژ بە گەلی کورد کەڵکی وەرگرتووە چونکە سەدام حوسەین نەیدەتوانی ئەخلاقی کوردەکان تیکبشکێنیت. یەکێ لە شێوەکانی ژینوسایدی ئەخلاقی ئەوەیە کە بۆ نموونە خەڵك تووشی بەکارهێنانی بەردەوامی ئەلکۆل و مادە هۆشبەرەکان بکەیت. تا ئەو شوێنە کە من دەزانم کێشەیەك بە ناوی کێشەی مادە هۆشبەرەکان یا خواردنەوەی ئەلکۆل لە نێو کوردەکانی عێراقدا نییە، بەڵام لە کوردستانی ئێران بەکارهێنانی مادە هۆشبەرەکان ، بە تایبەت تریاك لە نێو گەنجەکان بووە بە کێشەیەکی ئەوەندە گەورە کە لە چوارچێوەی ژینوسایدی ئەخلاقیدا دەگونجێت. بە بۆچوونی من دوو شێوە ژینوسایدی دیکە هەیە کە بریتین لە ژینوسایدی ژینگەیی و ئاماری. سەدام حوسەین لە هەردووی ئەم شێوە ژینوسایدانە لە کوردستان (بە تایبەت لە کەرکووك ) کەڵکی وەرگرتووە و کۆمەڵێك کێشەی جدی بە هۆی ئەم دوو شێوەیە درووست بووە کە تا ئێستاش هەر بەردەوامە. ژینوسایدی ژینگەیی بە واتای لەناوبردنی بەردەوامی ژینگەیە کە کار بکاتە سەر ژیانی کۆمەڵێك مرۆڤ بۆ ماوەی چەند نەوە. ئێستا بە هۆی ئەم شێوە ژینوسایدە کەس ناتوانێت لە هەندێ شوێندا بژیت.

سوپای عێراق جگە لەو ژینوسایدە فیزیکییە کە بە چەکی کیمیایی لە هەڵەبجە ئەنجامی دا ، ژینوسایدی ژینگەییشی لە هەڵەبجە ئەنجام دا کە ئاسەوارەکانی ژەهرەکەی هێشتا لە ناو ژینگەدا ماوەتەوە، هێشتا ناوی هەڵەبجە پیسە و

خەڵکی هەڵەبجە زیاتر لە خەڵکی دیکەی عێراق تووشی شێرپەنجە و نەخۆشییەکان دیکە دەبن. نموونەی دیکە گەرمیانە کە تێیدا سەدان هەزار کەسی گوازراوەتەوە بۆ هەندێ شوێنی پیس. ئەو شوێنانە کە سەرەتا کەمپی ئاوارەکان بووە، ئێستا بووە بە شوێنی ژیانی هەمیشەیی خەڵك، بۆ نموونە کەلار لە لێواری بیاباندایە.

ژینوسایدی ئاماری بە واتای دەست بردن لە ناو ئامارەکان و چەواشەکردنی راستییەکانی ژمارەی دانیشتووان و لێکۆڵینەوەکاندایە. سەدام حوسەین ئەم شێوە ژینوسایدەی بە تایبەت لە پارێزگای کەرکووکدا ئەنجام داوە.

ژینوسایدی کورد رەوتێکە کە بە ماوەی چەند دەیە درێژەی بووە. بۆمبارانی کیمیایی هەڵەبجە چەند رۆژی خایاندووە و ئەنفال چەند مانگ درێژەی هەبووە. خۆشبەختانە دادگای باڵای تاوانەکانی عێراق سەرەنجام بومبارانی کیمیایی هەڵەبجەی بە ژینوساید ناساند،بەڵام کۆمەڵگای نێونەتەوەییش دەبێ رەوتی ژینوسایدی کوردستان بە تەواوی بە فەرمی بناسێ، چونکە بۆمبارانی هەڵەبجە تەنها یەکێ لە نموونەکانی ژینوسایدی کوردەکانە و (ئەنفال)یش یەکێکی دیکە لەترسناکترین بەشەکانیەتی. بەهەرحاڵ لە قەرەداخ و بارزان و گەلێ شوینی دیکە لە دەیەی ۱۹٦۰ بەم لاوە ژینوساید کوردەکان رووی داوە و قوربانییەکانی، قوربانی ژینوسایدن نە قوربانی کۆمەڵکوژیگەلی سادە.

**پرسیار: کێشەی کورد چ پێگەیەکی لە سیاسەت و هاوکێشەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا هەیە؟**

**رابێرت نولسۆن:** پێگە و گرنگی کێشەی کورد لە چوارچێوەی سیاسەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، یەکلاییکەرەوەیە. بەلەبەرچاوگرتنی ئەو راستیە کە کێشەی کورد، کێشەی سەرەکی سیاسەتە ناوچەییەکانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە، ئەم کێشەیە کاریگەری لەسەر سیاسەتەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بەنیسبەت هەمو وڵاتانی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دادەنێت. کەوابوو کێشەی کورد لە ریزی سێیەم یا چوارەمی لیستی گرنگترین سیاسەتی پەیوەندیەکانی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتووەکاندایە. ئەڵبەتە کێشەی کورد بە هۆی ئەوەی کە بە شێوەی راستەوخۆ کاریگەری لەسەر بەرژەوەندیەکانی نەوت و گازی ئەمریکا لە عێراق و وڵاتانی کەنداو هەیە، یەکجار گرنگە. کەوابوو ئەم سیاسەتە دەبێ باش بەڕێوە ببردرێت بۆ ئەوەی دەوڵەتی عێراق ، دەوڵەتانی عەرەبی سوننەی ناوچە و تورکیە نەڕەنجێنێت، بەڵام بۆ ئەمریکا زۆر گرنگ نییە کە ئەم سیاسەتە ئێران بڕەنجێنێت .

**لیام ناندیرسۆن :** کوردەکان فاکتۆریکی گرنگن لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست و عێراقدا، بەڵام دەستیکەم گیراون. لێکۆلەر و توێژەرە رۆژئاواییەکان زۆر لە سەر کوردەکان توێژینەوە ناکەن، کەوابوو زۆربەی جیهانی ئاکادیمیك لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و رۆژئاوا لە روانگەی عەرەبیەوە لە سەر روژهەڵاتی ناوەڕاست و عێراق توێژینەوە دەکەن . لە

پەیوەندی لەگەڵ رەوتی دیموکراسی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا، بە بۆچوونی من کوردەکانی عێراق وەك نموونە و مۆدیلێك بۆ ناوچە سەیر دەکرێن

**نۆفرا بینگیو:** کوردەکان بە هۆی پێشهاتەکانی عێراق و هەندێ وڵاتی دیکەی دراوسێ، لەم چەند ساڵەی دواییدا گرنگییەکی زۆریان پەیدا کردووە. باشترین رێگا بۆ ئەوەی لەم گرنگییە تێبگەین ئەوەیە کە بارودۆخی ئێستای کوردەکان لەگەڵ دەیەی ١٩٨٠ بەراورد بکەین. پێشتر کوردەکان تەنها کارتێك بوون لە دەستی هێزە جۆراوجۆرە ناوچەیی و نێونەتەوەییەکاندا، بەڵام ئێستا لە ناوخۆیاندا یەکگرتوون و لە بەغداد دەورێکی هاوسەنگی گرنگ دەگێڕن و پێگەیان لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا دیارە.

**توماس نابریسیۆ:** بە بۆچوونی من لە بارودۆخی ئێستادا، کێشەی کورد پاش کێشەی ئێران گەورەترین کێشەی ناوچەیە. سەرهەڵدانی ئێران و کاریگەری رۆژبەرۆژ روو لە زیادبوونی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی عەرەبیدا (واتا پشتیوانی ئێران لە حەماس و حیزبوڵڵا) گەورەترین کێشەی ناوچەیە. ئەم مەسەلەیە واتا پشتیوانی ئێران لەم گروپانە (کە هۆکاری سەرەکیی بەرخۆدانی جیهانی ئیسلام لە بەرامبەر ئیسراییلە) و سەرهەڵدانی ئێران وەك هێزێکی ناوکی، سیاسەتی ناوچە کە لە داهاتوودا دادەڕێژێت.

بەهەرحاڵ کۆمەڵێك ڕێگا هەیە بۆ ئەوەی کێشەی کورد ببێت بە کێشەی سەرەکی عێراق و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. یەکەمین و روونترین ڕێگا ئەوەیە کە ئەگەر عێراق لە رووی سیاسیەوە ناسەقامگیر بێت و (یا) عەرەب و کوردەکانی عێراق نەتوانن ڕێگاچارەیەك بۆ کێشەکانیان بدۆزنەوە (وەك کێشەی تەعریبی باکووری عێراق، مەسەلەی ناوچە جێناکۆکەکان ، مەسەلەی نەوت و فیدرالیزم)، ئەو کاتە کوردەکان زیاتر بۆ جیابوونەوە لە عێراق هەنگاو هەڵدەگرن و لە ئەنجامدا ئەگەر داهاتووی عێراق روبەڕووی کێشە ببێتەوە، سەقامگیری ناوچەش رووبەڕووی کێشە دەبێتەوە. بە هەمان شێوە ئەگەر ناکۆکییەکانی شیعە و سوننە سەرهەڵبداتەوە یا کێشەکانی شیعەکان پەرەبسێنێت، ئەمەش دەتوانێت ببێتە هۆی پارچەپارچەبوونی عێراق. کەوابوو لەوانەیە ئەم هۆکارانە ببێتە هۆی ئەوەی کوردەکان ڕێگای خۆیان بگرنەبەر. ئەگەر ئەم گریمانانە ببێتە راست، ئەو کاتە کێشەی کورد بۆ ئەکتەرانی ناوچەیی و نێونەتەوەیی گرنگی زیاتر پەیدا دەکات.

**ماریانا شرونتاکی:** ئێستا کوردەکانی عێراق ئیدی نەتەوەیەکی بێ دەوڵەت نین کە بۆ سەرەتاییترین مافەکان و ئازادی خەبات بکەن، بەڵکو خاوەن کیانێکی سەقامگیرن کە ئۆتۆنۆمیەکەیان لەلایەن یاسای بنەڕەتی عێراقەوە بە فەرمی ناسراوە. ئەم گۆڕانکاریە لە سیاسەتی دەرەوەی ئامریکادا پشتگوێ نەخراوە یا لە لایەن دەوڵەتانی دراوسێوە پشتگوێ

نەخراوە (کە لە پەرەسەندنەکانی ئەم دواییانەی پەیوەندییەکانی نێوان تورکیە و حکوومەتی هەرێمی کوردستاندا دیارە). کەوابوو کوردەکانی عێراق ئێستا لەچاو رابردوو بۆ هاوسەنگی هێزەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست گرنگی زیاتریان پەیدا کردووە، چونکە کوردەکان دەوری بنەڕەتیان لە رووخانی سەدامدا گێڕا و لەگەڵ دەوڵەتە سەرەکیەکانی دیکەدا لە گۆڕەپانی سیاسەتی دەرەوەدا هەڵسوکەوت دەکەن. بە هۆی ئەوەی کە هاوکاری کورد و ئامریکا رووخانی سەدامی ئاسان کرد (لە ساڵی ۲۰۰۳)، کێشەی کورد بووە بە یەکێ لە بەشە زۆر گرنگەکانی گۆڕەپانی سیاسی عێراقی پاش سەدام و کوردەکان وەک هۆکاری راگرتنی سەقامگیری سیاسی عێراق و یەکپارچەیی خاکی عێراق دەرکەوتن.

بە بۆچوونی من بەرەوپێشچوونی کێشەی کورد ، لەوانە لە پەیوەندی لەگەڵ ئابووری سیاسی و رەوتە دیمۆکراتیکەکان کە رێز لە مافی دەوڵەتانی ناوچە و هێزە بێ دەوڵەتەکان بگرێت ، دەتوانێ ببێتە هۆی دیمۆکراتیزەبوونی ناوچە یا لانی کەم ببێتە هۆی نەمانی ناکۆکیە توندەکانی گۆڕەپانی سیاسی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستی پاش شەڕ.

**هاکان ئوزنوغلوو :** سەرهەڵدانی کێشەی کورد لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەگەڕێتەوە بۆ ئەو کاتە کە بیرۆکەی "ناسیونالیزم" دزەی کردە ناو ناوچە. لەو قۆناخەدا وەفادارییە سیاسیەکانی خەڵك لە چوارچێوەی هێڵە

ئـاییـنی(و ئـەتنیکییـەکانـدا) پێناسـە دەکـرا. سـەرهـەڵـدانی ئـەتنیـسیتە وەك هۆکـارێکی سـەرەکـی بـۆ وەفـاداری سیاسـی هاوکـات بـوو لـەگـەڵ لـەیـەکهـەڵـوەشـانەوەی ئیمپراتـۆری عوسـمـانی. بـە دروسـتبوونـی سـنووره سیاسـییه نوێکـان لـە رۆژهـەڵاتـی نـاوەڕاسـت، خـەڵکـی کـورد لـە نێـوان چـەنـد وڵاتـدا (تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا ) دابـەش بوون و بـەشـی هـەرە زۆریان کەوتنە ناو تورکیـا کـە میراتـی ئیمپراتـۆری عوسمـانی بۆ مابووەوە.

لە لایەکی دیکەوە، کوردەکـانی عێـراق لـە ئێـستادا باشـترین پێکهاتـەی سیاسـیان لـە نـاو حکوومـەتـی هـەرێمـی خۆیانـدا هەیە. عێراق تـەنها شوێنێکە کە کوردەکان، خۆیان حکوومەتـی خۆیـان بـەڕێـوە دەبـەن. ئێـستا کوردسـتانی عێـراق ئـارامـە و کوردەکان ئـامـانجی یەکگرتویان هـەیە.

**ئیسماعیل بیشکچی** : لـە مـاوەی ئـەم ١٠ سـاڵـەی دواییـەدا، کوردەکان بوونە بە فاکتۆرێکی گرنگ لە سیاسەتی رۆژهـەڵاتـی ناوەڕاستدا. بوونـی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بووتـە هـۆی ئـەوەی کـوردەکـان لـە گـۆڕەپـانی نێونـەتـەوەییـدا رۆژ بـە رۆژ بەهێزتر بن . بە بۆچوونی من یەکێکـی دیکـە لـە هۆکـارەکـانی بـەهێزبـوونی کـوردەکـان لـە رۆژهـەڵاتـی نـاوەڕاسـت، شـەڕی گریلاکانی PKK لە باکووری کوردستانە.

**گونەش تەزجور:** بە بۆچـوونـی مـن، کێـشەی کـورد پـاش کێـشەی فەلـەستین، گـەورەترین و نێونـەتەوەییـترین کێـشەی ئـەتنیکـی

رۆژهـەڵاتـی نـاوەڕاستـە. چـوار هێـزی گـەورەی ناوچـە (ئێـران، عێراق، تورکیـا و سـوریا ) تیـوەگلاونـە نـاو ئـەم کێشـەیـە و بـە ملیۆنەها کورد لـە نێو ئـەم وڵاتانـەدا بـڵاو بوونـە. ئـەم وڵاتانـە لــە گــەلــێ رووەوە بــەرژەوەنـدی هاوبــەشـیان لــە راگــرتن و کەمکردنـەوەی ناسیونالیزمی کورددا بووە و هـەیـە. لـە هـەمـان کاتدا، روونـە کـە ئـەم دەوڵـەتانـە ناتوانن لـە درێژخایـەنـدا پێش لـە ناسـیونالیزمـی کـورد بگـرن، مـەگـەر ئـەوە کـە داواکارییـە رەواکانی هاووڵاتیانی کوردی خۆیان بە فەرمی بناسن. ئەگەر بە خۆشبینییەوە سەیر بکـەین، بـە گشتی دەبـێ چاوەڕوانـی ئـەوە بـین کـە رەوتـی دیموکراسـی لـەم وڵاتانـە، ببێتـە هـۆی چارەسەربوونی ئاشتیخوازانەی کێشەی کورد، بەڵام ئەگەر بـە بەدبینییەوە سەیر بکەین، لەوانـەیە بەو ئەنجامـە بگـەین کـە هەوڵە دیموکراتیکەکان لەم وڵاتانە، لەوانەیە زیاتر ناکۆکییـە ئەتنیکییەکان هان بدات و توندوتیژی بە دواوە بێت.

**کارۆل پرۆنهۆبیر:** کوردەکان گەورەترین نەتەوەی بـێ دەوڵـەتـی جیهـانن و کێـشەی کـورد پـاش کێـشەی فەلەسـتین گرنگتـرین مەسەلەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستە. ٢٢ وڵاتـی عـەرەب پشتیوانـی لە ئامانجی فەلەستینیەکان دەکەن، بەڵام کوردەکان نەتەنیا لەم پشتیوانیە نێونەتەوەیە بێبەشن، بەڵکو لە لایەن چەند وڵاتی دراوسێی نادیموکراتەوە گەمارۆ دراون .

بارودۆخی کوردستانی عێراق هیوابەخشە و نموونەیەکە بۆ کـوردی پارچەکـانی دیـکە و وڵاتـانی دیـکە. هاوپەیمـانی کوردەکانی عێراق لەگەڵ رۆژئاوا ، بەتایبەت لەگەڵ ئەمریکا

نیشانی داوه کە کوردەکان شەریکێکی باوەڕپێکراون. ئەمڕۆ کوردەکان هۆکاری یەکلاییکەرەوەی سەقامگیری و سەرکەوتنی عێراقن و ڕێبەرایەتی کورد نیشانیداوە کە خۆی لە بەرامبەر ئەم ڕەوتە بە بەرپرسیار دەزانێت .

دەوڵەتی ئێران لەگەڵ خەڵکی ئیران لە شەڕدایە و چەوساندنەوەی کوردەکانی ئێران بەردەوامە. کوردەکانی سوریەش لە بارودۆخێکی هاوشێوەدان و سەرکوت دەکرێن و فەراموش کراون .

سەرکەوتنی ئامانجی کورد لە هەر کام لە پارچەکانی کوردستان کاریگەری ئەرێنی لە سەر پارچەکانی دیکەی کوردستان دەبێت. دەوڵەتی تورکیە بەهیواشی بەرەو دەستەبەرکردنی مافەکانی کوردەکان هەنگاو هەڵدەگرێت بەڵام سیاسەتە سەرکوتکارانەکانی خۆی کەمتر کردووەتەوە.

**ویلیام بیل:**

ئەگەر ڕەوتی دیموکراسی گرنگترین هۆکاری مەسەلەی کورد ببایە، ئەوکاتە بزاڤی زیاتر بە نیسبەت مافی چارەی خۆنووسینی کورد لە ئارادا دەبوو و لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا پشتیوانی زیاتری لێدەکرا، بەڵام بەهەرحاڵ هیچ دەوڵەتێکی ناوچە (عێراق، تورکیا، ئێران و هیچ وڵاتێکی عەرەبی دیکە) ڕازی نییە کە دەوڵەتێکی کوردی دروست بێت. ئەم دەوڵەتانە بەنیسبەت یەکپارچەیی وڵاتانی ئێستای ناوچە نیگەرانن، چونکە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی دەبێتە هۆی ناسەقامگیربوونی ناوچە و سەرهەڵدانی ناکۆکی، و لەئەنجامدا هاوسەنگی هێزەکان لە ناوچە تێکدەچێت. نە

ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نە وڵاتانی ئەوروپایی هیچکامیان ئامادە نین لە سەر مەسەلەی کورد لەگەڵ وڵاتانی ئێستای ناوچە رووبەڕوو ببنەوە، هەرچەند کە بەتایبەت دەوڵەتی تورکیا هەندێ جار بانگەشەی ئەوە دەکات کە رۆژئاوا چالاکانە پشتیوانی لە دروستبوونی دەوڵەتێکی کورد دەکات. کەوابوو دەمەوێت بە کورتی ئەوە بڵێم کە لە پەیوەندی لەگەڵ مەسەلەی کورددا، سیاسەتی هێزەکان لە فاکتوری دموکراسی بۆ سەرجەم لایەنەکان گرنگترە.

**ژۆردی تێژەل:** بارودۆخی کورد لە ماوەی چەند ساڵی رابردوودا باش پێشکەوتوە، بەڵام کوردستان و مەسەلەی کورد نیگەرانی سەرەکی پەیوەندیە نێونەتەوەییەکان و ژئۆپۆلۆتیکی نێونەتەوەیی نیە. هەرچەند کە کێشەی عەرەب-ئیسرائیل لە ١٠ ساڵی رابردوودا گرنگی خۆی تا رادەیەک لە دەسداوە بەڵام هێشتا کێشەی سەرەکی رۆژهەلاتی ناوەڕاستە. یەکێ لە مەسەلە گرنگەکانی دیکەی ژئۆپۆلۆتیکی نێونەتەوەیی ، مەسەلەی ئێران و ئاسیای ناوەڕاستە (نەتەنیا بۆ روسیە و ئەمریکا بەڵکوو بۆ تورکیە و یەکێتی ئوروپاش). کێشەی کورد و کوردستان هەمیشە یەکێ لە کێشەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاست بووە، بەڵام قەت نەبووە بە ئەجیندای سەرەکی هێزەکانی رۆژئاوا و ئوروپا .

**پرسیار: کارنامەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و رێبەرایەتی کورد چۆن هەڵدەسەنگێنیت؟**

**دانییل سێرڤێر:** هەرێمی کوردستان لە عێراق لە راستیدا ئەزموونێکی بێ وێنەیە لە رۆژهەڵاتی ناوەراستدا، چونکە دەوڵەتی عێراق ، وەک زۆربەی دەوڵەتانی دیکەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەر لە کۆنەوە دەوڵەتێکی ناوەندچی بووە، بەڵام حکوومەتی هەرێمی کوردستان ئۆتۆنۆمییەکی زۆر بەرفراوانی هەیە. گرنگ ئەوەیە کە ئەم ئەزموونە سەربکەوێت و ببێت بە نموونەیەکی ئەرێنی بۆ وڵاتانی دیکە.

**جاناتان رەندێل:** دەستکەوتی هەرە گەورەی حکوومەتی هەرێمی کوردستان ئەوەیە کە لە ماوەی نزیکەی ٢٠ی ساڵی رابردوودا توانیویەتی درێژە بە بوونی خۆی بدات و لە راستیدا توانیویەتی دەنگی خۆی بگەیەنێتە ناوخۆی عێراق و دەرەوەی وڵات. واتای ئەم سەرکەوتنە ئەوەیە کە جیهانی دەرەوە ئێستا شتی زیاتر دەربارەی کوردەکان و ئێش و ئازارەکانیان و ئامانجەکانیان دەزانێت. کێ ١٠ ساڵ لەمەو پێش بیری لەوە دەکردەوە کە جەلال تاڵەبانی ببێت بە سەرۆك کۆماری عێراق و هۆشیار زیباری ببێت بە وەزیری دەرەوەی عێراق ؟ کێ بیری لەوە دەکردەوە کە کوردەکان ئەوەندە متمانە و باوەڕ بەخۆبوون بە دەست بهێنن کە نەتەنها نوێنەرایەتی ئامانجەکەی خۆیان بکەن ، بەڵکو ببن بە نوێنەری بەرژەوەندی سەرجەم خەڵکی عێراق .

**ليام ناندیرسۆن:** بە بۆچوونی من حکوومەتی هەرێمی کوردستان و رێبەرایەتییەکەی لە بارودۆخی زۆر دژواردا ، باش کاری کردووە. بەهەرحاڵ حکوومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵ کۆمەڵێك کێشە رووبەڕوویە، بەڵام خاڵی گرنگ ئەوەیە کە بە گشتی رێبەرایەتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان توانیویەتی یەکگرتوو بێت و ئاسایشی ناوچە بپارێزێت و خزمەتی گرنگ بە رەوتی دیموکراسی بکات . بەهەرحاڵ، پێویستە سیستمی سیاسی هەرێمی کوردستان تا رادەیەك کراوەتر بێت و زیاتر خزمەت بە پێشکەوتنی ناوچە بکات. بە بۆچوونی من ئەم ئامانجە بەدی نایێت ئەگەر هەندێ مەسەلەی زۆر گرنگ وەك مەسەلەی کەرکووك چارەسەر نەکرێت.

**مایکیل گەنتەر:** بەلەبەرچاوگرتنی ئەو کێشە زۆرانە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان لەگەڵیدا رووبەڕوویە من پێموایە رێبەرایەتی هەرێمی کوردستان هەنگاوی ئەرینی زۆری هەڵگرتووە و کاری زۆری کردووە .
بە لەبەرچاوگرتنی دەسکورتی رێژەیی حکومەتی هەرێمی کوردستان(بە بەراورد لەگەڵ دەرەتانە زۆرەکانی دەوڵەتی تورکیا و دەوڵەتی بەغداد) لۆبی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە ویلایە تە یەکگرتووەکانی ئەمریکا باش بووە و کۆمەڵێ سەرکەوتنی بە دەست هێناوە. قوباد تاڵەبانی، نوێنەری حکومەتی هەرێمی کوردستان لە وڵاتە یەکگرتووەکان بە باشترین شێوە کار دەکات و توانیویەتی

دەستکەوتی زۆر بۆ کوردەکان بەدەست بهێنێت. لە لایەکی دیکەوە (پێمان خۆش بێت یا ناخۆش بێت) کوردەکانی تورکیا لە ولاتە یەکگرتووەکان وەك خەڵکێك سەیر دەکرین کە پەیوەندی زۆر نزیکیان لەگەل PKK هەیە کە ولاتە یەکگرتووەکان بە رێکخراوێکی تروریستی لەقەڵەمی دەدات. لە ئەنجامدا، ئامانجی کوردەکانی تورکیا لە ولاتە یەکگرتووەکان ئەوەندەی برا کوردەکانیان لە باشوور پێشوازی لێناکرێت. ئەم بارودۆخە بە هۆی هاوپەیمانی درێژخایەنی ولاتە یەکگرتووەکان و تورکیا بەردەوام دەبێت.

**نۆفرا بینگیو:** رێبەرایەتی کورد نیشانی داوە کە دەتوانێت لە گۆڕەپانی ئالۆزی سیاسەتدا هەم لە ناو هەرێمی کوردستان و هەم لە بەرامبەر بەغداد کایە بکات.

**توماس نابریسیۆ:** هەرێمی کوردستان تا رادەیەکی زۆر سەقامگیرە و لە زۆربەی بەشەکانی تری عێراق ئاسایشی باشترە. ئەڵبەتە هەر سیستمێك کە ئاڵوگۆڕ لە خۆیدا پیك نەهێنێت لەگەڵ راوەستان و گەندەڵی رووبەڕوو دەبێتەوە و پەیوەندی نێوان خەڵك و حکومەت دەپچڕێت. ئەمە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هەموو سیستمە سیاسیەکاندا روو دەدات. رکابەری هەمیشە باشە بۆ سیستمە دیموکراتیەکان.

**کارۆل پرۆنهۆبێر:** سەرکەوتنی حکومەتی هەرێمی کوردستان لە عێراق پێشکەوتنێکی گرنگ بۆ سەرانسەری ناوچەیە و ئەگەر حکومەتی هەرێمی کوردستان درێژە بە بەڕێوەبردنی دەوڵەتی خودموختاری کوردستان لە ناو دەوڵەتێکی نەوەندیدا بدات ئازموونی هەرێمی کوردستان دەتوانێت ببێت بە نموونەیەک بۆ وڵاتانی دیکەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لەمە زیاتر داواکاری ئەم دوایەی مەسعود بارزانی و دروشمی پارتی دیموکراتی کوردستان بۆ مافی چارەی خۆنووسینی گەلی کورد هەنگاوێکە بەرەو گەیشتن بەو شتەی کە کوردەکان هەمیشە بە مافی خۆیان زانیوە. کوردەکان لە نێو دەوڵەتی فیدراڵی عێراقدا دەمێننەوە تا ئەو کاتە کە یاسای بنەڕەتی عێراق ڕێز لە مافەکانیان بگرێت.

**پرسیار: داهاتووی هەرێمی کوردستان لە عێراق چۆن دەبینیت؟**

**مایکڵ گەنتەر:** ئێستا ناسیونالیزمی کورد لە عێراق خاوەن دەسەلاتێکی بێ وێنەیە، چونکە هێزی ڤیتۆکردنی پێشهاتەکانی داهاتووی عێراقی هەیە. ئەگەر عەرەبەکان رازی نەبن بە عێراقێکی فیدرالی دیموکرات کە ئامانجەکانی ناسیونالیزمی کورد تێیدا بەدی بێت، کوردەکان بەردەوام دەبن لە بەرێوەبردنی کاروباری خۆیان کە لە ساڵی ۱۹۹۱ تا ئێستا بەرێوەیان بردووە. لە راستیدا دوو ریفراندۆمی نافەرمی لە ساڵی ۲۰۰٤ و ۲۰۰٥ بەرێوەچوو کە کە تێیدا خەڵك بە تێکڕا دەنگی بە سەربەخۆیی کورد دا . ئەڵبەتە راستییە ژیوپلۆتیکەکان لە ئێستادا ناهێڵێت کوردەکان سەربەخۆ بن، بەلام کێ دەتوانێت پێشبینی ئەوە بکات کە داهاتوو چۆن دەبێت ئەگەر بێت و عێراقێکی دیموکراتی فیدراڵ دروست نەبێت. لەوانەیە ئەوکاتە (بە ناوی پاراستنی سەقامگیری کە بە قازانجی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ، تورکیا و دەوڵەتانی دراوسێی دیکە بێت) مافی ئەوە بۆ کورد بە رەوا ببینرێت کە بەرەو سەربەخۆیی هەنگاو هەڵبگرێت.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەو راستییە کە کوردستانی گەورە خاوەن رێژەیەکی بەرچاوی نەوت و ئاوە لە رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا، ناسیونالیزمی کورد بە دڵنیاییەوە کاریگەری لە سەر داهاتووی ناوچە بە تایبەت و داهاتووی جیهان بە گشتی دەبێت. کەوابوو دەوڵەتانی دیکە بۆ رووبەڕوونەوە لەگەڵ ئەم ئەنجامانە و دەوڵەت و نەتەوەکانی دیکە، دەبێ

ڕەوایەتی بە ناسیونالیزمی کورد بدەن. ئەگەر سەرەتا دان بەم ڕەوایەتییەدا بنرێت لەوانەیە پاشان ڕێگاچارەیەکی دادپەروەرانە و درێژخایەن بۆ کێشەکان بدۆزرێتەوە.

بۆ وەدیهاتنی مافی چارەی خۆنووسین بۆ نەتەوەی کورد پێویست ناکات حەتمەن یەکپارچەیی خاکی ئەو وڵاتانە کە کورد تێیاندا دەژی، لەناو بچێت. شێوەگەلی جۆراوجۆری ئۆتۆنۆمی، فیدراڵیزم و تەنانەت دیموکراسییەکی سادە، بەڵام ڕاستەقینە لەوانەیە داواکارییە ڕاستەقینەکانی ناسیونالیزمی کورد دابین بکات. لەم ڕوانگەیە ڕێگاچارە لەوەدایە کە ڕێوشوێنە نوێکانی مافی مرۆڤ بۆ نەتەوەی کورد پەیڕەو بکرێت. ئەنجامێکی وەها لەوانەیە سەداسەد سەر نەگرێت، بەڵام دەبێتە هۆی پەیدابوونی ڕێگاچارەیەك بۆ هەموو ئەو ناسیوناڵیزمانە کە پەیوەندییان بەم مەسەلەیەوە هەیە. کەوابوو داهاتووی ناسیوناڵیزمی کورد چۆن دەبێت، دیار نییە.

**ئیسماعیل بیشکچی** : من داهاتووی کوردەکان زۆر درەوشاوە دەبینم . لە سەدەی ٢٠ ، زلهێزەکان وەك بریتانیا و فەرانسا و دەوڵەتانی فارس، تورك و عەرەب بە هاوکاری ئەم زلهێزانە کورد و کوردستانیان پارچە پارچە کرد . ئەمە نەتەنها بووە هۆی دابەشبوونی خاکی کوردستان، بەڵکو کاری کردە سەر زەینییەت و دەروونی کوردەکان و کوردەکان بە تەنیا مانەوە. لەو کاتەوە تا ئێستا ئەم بارودۆخە هەر وەك خۆی ماوەتەوە و ئاڵوگۆڕێکی ئەوتۆی بە سەردا نەهاتووە، بەڵام خۆشبەختانە ئەمریکا لە سەرەتای ئەم سەدەیەدا توانی

درزێکی گەورە بخاتە ناو ئەم بارودۆخە . بە بۆچوونی من ئەم درزە رۆژبەرۆژ گەورەتر دەبێت و کوردەکان رۆژبەرۆژ زیاتر دەتوانن بیرۆکە و سیستمی دەسەڵاتداری و بەڕێوەبردنی کاروباری خۆیان ، پەرە پێبدەن و بەرەو پێشی بەرن.

**هاکان نوزنوغلوو :** لە سەرانسەری مێژوودا، هەمیشە گەلێك ناکۆکی لە سەر بەرژەوەندی ناوچەیی و نێونەتەوەیی لەم ناوچە جوگرافییەدا لە ئارادا بووە. بەبۆچوونی من پێکهاتنی ئاڵوگۆڕ لە بارودۆخی کوردەکان(چی بە شێوەی دروستبوونی کوردستانێکی سەربەخۆ بێت یا هەرچەشنە ئاڵوگۆڕێکی دیکە لە سنووره سیاسییەکانی حکوومەتەکانی ئێستا) تەنها کاتێك روو دەدات کە کۆمەڵێك فاکتۆری ناوخۆیی، ناوچەیی و لەوەش گرنگتر، گوشارگەلی دەرەکی پێکەوە تێکەڵ بن. روونە کە چارەسەربوونی کێشەی کورد لە تورکیا ، عێراق و شوێنەکانی دیکە، زۆر پەیوەندی بە تیکەڵبوونی بەرژەوەندی ئەو هێز و لایەنە ناوخۆیی، ناوچەیی و نێونەتەوەییانە هەیە کە ئامارەمان پێکردن. فاکتۆرگەلی یەکجار زۆر هەن کە رەوتی مێژوو دیاری دەکەن. کەوابوو هیچ کەس ناتوانێت پێشبینی ئەوە بکات کە داهاتوو چۆن دەبێت . بەهەرحاڵ کۆمەڵێك ئەگەر لە ئارادایە ، کە پارچەپارچەبوونی عێراق یەکێ لەم ئەگەرانەیە.

بە بۆچوونی من، لایەنێك کە زۆرترین قازانجی لە دوای دروستبوونی بۆشایی دەسەلات لە عێراق لە ئەنجامی

پاشەکشەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق دەست دەکەوێت، کوردەکانن. کوردەکان هەرچەند کە بە ناو بەشێکن لە عێراق بەڵام لە کردەوەدا لە زۆربەی رووەوە سەربەخۆن. حکوومەتی هەرێمی کوردستان باش دەزانێت کاتێك کە هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق بچنە دەرەوە یا سەرنجی ئەمریکا بەرەولای شوێنەکانی دیکەی جیهان رابکێشرێت، بۆشاییەکی دەسەڵات لە عێراق دروست دەبێت کە بە قازانجی کوردەکان تەواو دەبێت . ئەو کاتە کونترولکردنی سەرچاوە نەوتییەکانی کەرکووك لەوانەیە تەنها رێگای مانەوەی (کوردەکان ) بێت (لانی کەم لە رووی ئابوورییەوە)، کەوابوو ئەو کاتە کوردەکان پێداگری لە سەر کۆنترلکردنی کەرکووك دەکەن.

**جاناتان رەندیل :**داهاتووی حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەوە گرێدراوە کە چی لە بەغداد و لە پێوەرێکی بەرفراوانتردا چی لە پایتەختی ولاتانی ناوچە روو دەدات، بەڵام داهاتووی حکوومەتی هەرێم پەیوەندیشی بەوە هەیە کە کوردەکان لە پەیوەندی لەگەڵ رەوتی دیموکراسی تا چەند دەتوانن کار بکەن و تا چەند کۆمەڵگای خۆیان بەرووی هێزەکانی دیکە دەکەنەوە یا لانی کەم تا چەند کەسانی دیکە لە ریزی خۆیاندا قبول دەکەن.

**لیام ناندیرسۆن :**من بەنیسبەت بارودۆخی ئێستای کوردەکان خۆشبینم، بەڵام کۆمەڵێك کێشە و گیرو گرفت لە ئارادایە. فاکتۆری یەکلاییکەرەوە بۆ کوردەکانی تورکیا ئەوەیە کە تورکیا ببێت بە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا، چونکە بۆ بەئەندامبوون لە یەکێتی ئەوروپا، تورکیا ناچارە رێز لە مافە سیاسی، کولتووری و زمانییەکانی کوردەکان بگرێت، بەڵام کێشەکە ئەوەیە کە زۆربەی رێبەرانی ولاتانی ئەورووپایی(ئانگیلا مێرکێل، سارکوزی و ..) پشتیوانی لە بەئەندامبوونی تورکیا لە یەکێتی ئەوروپادا ناکەن، کەوابوو زەحمەتە رێگا بە تورکیا بدرێت ببێتە ئەندامی یەکێتی ئەوروپا (لەوانەیە بۆ هەتاهەتایە).

کێشەی کوردەکانی عێراق ئەوەیە کە عەرەبەکانی عێراق رۆژ بەرۆژ ناسیونالیستتر دەبن و کەمتر پشتیوانی لە ئۆتۆنۆمی نەتەوەکانی دیکە لە عێراق دەکەن. تەنانەت سیاسەتمەدارانی عێراق هەوڵ دەدەن لە رێگای دژایەتیکردنی خودی کوردەکان ، پوانی سیاسی بەدەست بهێنن و ئەمە شتێکی مەترسیدارە .

**کێشەی کورد چی پێگەیەکی لە سیاسەتی دەرەوە و ئاسایشی نەتەوەیی ئەمریکادا هەیە؟**
ئایا ئەمریکا هیچ سیاسەت یا ئیستراتژیەکی بۆ کورد وەک نەتەوەیەک هەیە؟

**- هەڵوێست و سیاسەتی ئەمریکا بەنیسبەت سەربەخۆیی کوردستان چییە؟**
**سیاسەتی ئەمریکا بەنیسبەت کێشەی کەرکووک و ناوچە جێناکۆکەکان چییە؟**
**کشانەوەی هێزەکانی ئامریکا لە عێراق چی کاریگەریەکی لە سەر هەرێمی کوردستان و پەیوەندیەکانی ئامریکا و کوردستان دەبێت؟**

**سین کان:** کێشەی کورد و مەسەلەی عێراق بە گشتی بۆ سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا گرنگە. یەکێ لە هۆکارەکانی ئەو گرنگیە ئەوەیە کە ئیدارەی باراک ئوباما پێیوایە ئەگەر ناکۆکییەکانی کورد و عەرەبەکان چارەسەر نەکرێت، دەبێتە مەترسیەکی گەورە بۆ سەقامگیری عێراق. بەهەرحاڵ ئەو رێژە یەکجار زۆرەی گرنگیدان و سەرنجدانی ئەمریکا بە عێراق لە ۷ ساڵی رابردوودا (کە لە مێژووی ئەمریکادا بێ وێنە بووە) لە داهاتوودا دوپات نابێتەوە. لەگەڵ ئەمەشدا مەسەلەی عێراق و کێشەی کورد (لە عێراق) لە داهاتووشدا یەکێ لە مەسەلە گرنگەکانی سیاسەتی دەرەوەی ئامریکا دەبێت و ئەگەر نیگەرانی یەکەمی ئەمریکا نەبێت، بێگومان یەکێ لە گرنگترینەکانی دەبێت. ئێستا ئەمریکا زیاتر گرنگی بە سیاسەتی ناوخۆ و کێشەکانی ناوخۆی ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا دەدات وەک بارودۆخی ئابووری .

**دانییل سێرفیر:** ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتانی ئەورووپایی دەیانەوێت کوردەکان لە چوارچێوەی وڵاتانی یەکپارچەی ئێران، عێراق، تورکیا و سوریا بە خۆشی بژین، بەڵام ئەورووپا و ئەمریکا لەگەڵ ئەوەدا نین کە هیچ جۆرە کوردستانێکی سەربەخۆ دروست بێت.

**رابێرت ئولسۆن:** ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا دەیانەوێت بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد بەهێز بێت و کوردەکانی عێراق مافی ئۆتۆنۆمیان هەبێت، بەڵام لایەنگری لە بزووتنەوەی سەربەخۆیی کورد ناکەن، چونکە دەبێت لەگەڵ دەوڵەتانی تورکیا، ئێران، عێراق و سوریا هاوکاری بکەن. ئەم مەسەلەیەش بۆ خۆی یەکێ لە گرنگترین کێشەکانە کە ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا لە گەڵیدا رووبەڕوونە، کێشەکەیان ئەوەیە کە چۆن ئەم نایەکانگیرییە کونترۆڵ بکەن. ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا بۆ ئەوەی کەڵك لە سەرچاوەکانی نەوت و گازی عێراق وەربگرن، ناچارن پشتیوانی لە دەوڵەتی بەغداد بکەن و لەمەو بەدوا پشتیوانی خۆیان لە حکومەتی هەرێمی کوردستان سنووردار بکەن. ئەو کێشەیە کە ئێستا ئەمریکا و یەکێتی ئەورووپا لە گەڵی رووبەڕوونە ئەوەیە کە تا چ رادەیەك پشتیوانی لە دەوڵەتی بەغداد بکەن بۆ ئەوەی کەڵك لە سەرچاوەکانی نەوت و گازی عێراق وەربگرن، بێ ئەوەی داواکارییەکانی عەرەبەکانی عێراق، بە تایبەت لە پەیوەندی لەگەڵ کێشەکانیان لەگەڵ

کوردەکان لە سەر کەرکووك و ناوچە جێناکۆکەکان، جێبەجێ بکەن .
ئەمریکا لایەنگری سەربەخۆیی کوردستان نییە. ئەمریکا پێویستی بە هاوکاری دەوڵەتی بەغداد و دەوڵەتە عەرەبە سوننەکان بەتایبەت عەرەبستانی سعودی هەیە، چونکە نەوت و گازی ئەم ولاتانە بۆ ئەمریکا و هەروەها ئوروپا گرنگە. ئەمریکا هەروەها پێویستی بەهاوکاری تورکیە هەیە بۆ ئەوەی یارمەتی بە کۆنترۆڵکردنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە عێراق و تورکیە بدات. ئەمریکا ناتوانێت بە پشتیوانیکردن لە سەربەخۆیی کوردەکان، ئەم دەوڵەتانە لە خۆی بێگانە بکات .
بەهەرحاڵ هەروەها کە ئامـاژەم پێکرد، ئەمریکا جگە لە کێشەی کورد کۆمەڵێک نیگەرانی گرنگی دیکەی هەیە کە بریتین لە یەکەم ناکارامەبوونی سیاسەتە ناوخۆیەکانی ئەمریکا ، دووەم لاوازبوونی ئابووری و هەلومەرجی جیهانی ئامریکا ، سێیەم پەیوەندیەکانی لەگەڵ چین ، چوارەم پەیوەندیەکانی لەگەڵ هیند، پێنجەم بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی لەگەڵ ئوروپا و شەشەم بەڕێوەبردنی سیاسەتەکانی لەگەڵ روسیا. لەپەیوەندی لەگەڵ کێشەی کورددا ئەو مەسەلەیە کە ئامریکا لەگەڵی رووبەڕویە ئەوەیە کە چۆن ئەو دەستەوکەوتانە بپاریزێت کە کوردەکانی عێراق لە ٢٠ساڵی رابردوودا و بەتایبەت پاش ساڵی ٢٠٠٦ بەدەستیان هێناوە .

ئەمریکا وەک دۆست سەیری کورد دەکات نە هاوپەیمان. ئەمریکا ناچارە کوردەکان وەک دۆستێکی گرنگی خۆی سەیر بکات، بەلاّم لەوانەیە کوردەکان بەهاوپەیمانێکی گرنگی خۆی نەزانێت، چونکە ئەمریکا پێویستی بەوە هەیە لەگەڵ ئەکتەرە بەهێزترەکانی رۆژهەلاّتی ناوەڕاست هاوپەیمان بێت. یەکێ لە کێشەکانی واشینگتۆن ئەوەیە کە چۆن ئەم هاوسەنگیە هەستیارە رابگرێت. ئەمە مەسەلەیەکە کە رۆژ بەرۆژ دژوارتر دەبێت، چونکە هەم دوژمنەکان و هەم دۆستەکانی واشینگتۆن پێیان خۆش نییە پێگەیان لە سەرانسەری رۆژهەلاّتی ناوەڕاست لاواز بێت .

**واین وایت:** ئەمریکا، دەوڵەتە بەهێزەکانی ئوروپا و رێکخراوە سەرەکیەکانی ئوروپا وەک یەکێتی ئوروپا و ناتۆ لە راستیدا هیچ سیاسەتێکی یەکگرتوویان بۆ کێشەی کورد نیە و زۆربەی جاران شێوەی هەڵسوکەوتی نێوخۆیی ئەم دەوڵەتانە لەگەڵ مەسەلەی کورد لەو ولاّتانە کە کورد تێدا دەژین، بۆ ولاّتێکی دیکە جیاوازە. کەوابوو گرنگی مەسەلەی کورد لە چوارچێوەی ولاّتی عێراق، ئێران، تورکیە و سوریەدا پێناسە دەکرێت .

نیگەرانی و کاردانەوەی کۆمەڵگای نێونەتەوەیی بەنیسبەت مەسەلەی کورد لە هەر کام لە ولاّتانە کە کورد تیاندا دەژی جیاوازە و شێوەی هەڵسوکەوتی دەوڵەتی عێراق، تورکیە، ئێران و سوریە لەگەڵ مەسەلەی کورد جیاوازە. کەوابوو گرنگی کیشەی کورد زۆرتر بەگوێرەی

بارودۆخی سیاسی ، نیگەرانی بۆ مەسەلەی مافی مرۆڤ ، نائارامیە مەدەنیەکان، مەسەلەی سەقامگیری رۆژهەلاتی تورکیە و کاریگەری ئەو مەسەلەیە لە سەر سیاسەتە ناوخۆیەکانی تورکیە، ناکۆکیەکان لە باکووری عێراق، بەرێوەبردنی ولاتی عێراق و بارودۆخی باکوری رۆژئاوای ئیران هەڵدەسەنگێندرێت .

**ویلیام بیل :** کوردەکان باشترین دۆستی ئامریکان لە عێراقدا. هەروەها زۆربەی کۆمەڵگاکانی رۆژئاوا لایەنگری پرەنسیپی مافی چارەی خۆنووسینن هەرچەند کە لە کردەوەدا قەد ئەم پرەنسیپەیان جێبەجێ نەکردووە، چونکە جێبەجێبوونی ئەم پرەنسیپانە کۆمەڵێک بەردیلی سیاسی بەدواوە دەبێت. کەوابوو ولاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا دەیەوێت کوردەکان بە شێوەیەکی ئەرێنی دەربکەون. لە لایەکی دیکەوە ئامریکا پشتیوانی لە یەکهەڵوەشانەوەی عێراق ناکات، چونکە نایەوێت دۆستەکانی خۆی لە تورکیە و جیهانی عەرەب لە خۆی برەنجێنێت. ئامریکا بە تەواوی ئاگاداری مەترسیەکانی ئەم مەسەلەیە. باشترین رێگا بۆ ئامریکا ئەوەیە کە کوردستانێکی خاوەن ئۆتۆنۆمی کە لە ژێر دەسەلاتی ئێراندا نەبێت و خۆی باش بەرێوە ببات لە ئارادا بێت .

ئەگەر رەوتی دیموکراسی گرنگترین هۆکاری مەسەلەی کورد ببایا، ئەوکاتە بزاڤی زیاتر بە نیسبەت مافی چارەی خۆنووسینی کورد لە ئارادا دەبوو و لە ئاستی ناوچەیی و نێونەتەوەییدا پشتیوانی زیاتری لێدەکرا، بەلام بەهەرحاڵ

هیچ دەوڵەتێکی ناوچە (عێراق، تورکیا، ئێران و هیچ وڵاتێکی عەرەبی دیکە)ڕازی نییە کە دەوڵەتێکی کوردی دروست بێت. ئەم دەوڵەتانە بەنیسبەت یەکپارچەیی وڵاتانی ئێستای ناوچە نیگەرانن چونکە دروستبوونی دەوڵەتێکی کوردی دەبێتە هۆی ناسەقامگیربوونی ناوچە و سەرهەڵدانی ناکۆکی و لەئەنجامدا هاوسەنگی هێزەکان لە ناوچە تێکدەچێت. نە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و نە وڵاتانی ئەوروپایی هیچ کامیان ئامادە نین لە سەر مەسەلەی کورد لەگەڵ وڵاتانی ئێستای ناوچە ڕووبەڕوو ببنەوە، هەرچەند کە بەتایبەت دەوڵەتی تورکیا هەندێ جار بانگەشەی ئەوە دەکات کە ڕۆژئاوا چالاکانە پشتیوانی لە دروستبوونی دەوڵەتێکی کورد دەکات. کەوابوو دەمەوێت بە کورتی ئەوە بڵێم کە لە پەیوەندی لەگەڵ مەسەلەی کورددا، سیاسەتی هێزەکان لە فاکتوری دموکراسی بۆ سەرجەم لایەنەکان گرنگترە.

لە ڕووی تیورییەوە گەلێ لە خەڵکی ئەوروپا و ئەمریکا لە سەر بنەمای پرەنسیپی دموکراسی، مافی مرۆڤ و مافی چارەی خۆنووسین زۆر هاوسۆزن لەگەڵ کوردەکان، هەروەها ئاگاداری ئەوەن کە تورک و عەرەبەکان لە ڕابردوودا چەندە خراپ لەگەڵ کوردەکان هەڵسوکەوتیان کردووە، بەڵام دەوڵەتانی ڕۆژئاوا پێیان خۆش نییە تورکیا پارچە پارچە بێت یا ئاڵۆزی تێ بکەوێت. هەروەها بەرژەوەندیان لەوەدایە کە عێراق سەقامگیر و بەهێز بێت، کەوابوو لە بارودۆخی ئێستادا کوردەکان نابێت چاوەڕوانی ئەوە بن کە ڕۆژئاوا

زیاتر لەوە بچێتە پێش کە داوای ڕێزگرتنی زیاتر لە مافی کوردەکان بکات و داوای بوونی نوێنەرایەتی سیاسی کوردەکان لە ناو وڵاتانی ئێستادا(لەوانە دەوڵەتی سوریا و عێراق) بکات.

مەسەلەی گرنگ ئەوەیە کە لەوانەیە عێراق نە لە لایەن کوردەکانەوە بەڵکوو لە ئەنجامی ڕێکنەکەوتنی خودی عەرەبەکان واتا شیعە و سوننەکان و یا لە ئەنجامی بەردەوامبوونی بێ سەرەوبەرەیی و قەیراندا لە یەکهەڵبوەشێتەوە یا بکەوێتە ژێر دەسەڵاتی ئێران. ئەو کاتە لەوانەیە کوردستانێکی سەربەخۆ و سەقامگیر وەک ڕێگایەکی سەرنجڕاکێشتر و سەقامگیرتر بێتە ئاراوە و هیوادارم ئامریکا ئەو کاتە هەوڵ بدات تورکیە و جیهانی عەرەب ڕازی بکات کوردستانی سەربەخۆ قبووڵ بکەن .

**ئالێند مێزیل:** وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا لە سیاسەتی دەرەوی خۆیدا ئێدی ناتوانێت کێشەی کورد پشتگوێ بخات چونکە ئەم کێشەیە کاریگەری لە سەر ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەیە. بۆ ماوەیەکی درێژ سیاسەتی دەرەوەی ئامریکا لەسەر بنەمای ئەو چەمکە بوو کە هیچ سەقامگیرییەک دەستەبەر نابێت مەگەر بەو مەرجە کە هاوسەنگی هێزەکان دژی یەکدی ڕابگیردرێت. بەهەر حاڵ پێموانیە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا یا یەکێتی ئوروپا هیچ بەرنامەیەکی ڕاستەقینەیان بۆ کوردەکان وەکو نەتەوەیەک هەبێت، چونکە تورکیا، ئێران ، عێراق و سوریە بۆ ڕۆژئاوا

گرنگن، کەوابوو ولاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا بە تەواوی کێشەی کورد پشتگوێ دەخات. لەوانەیە ئامریکا وەک ڕێگایەک بۆ ڕاگرتنی هاوسەنگی هێزەکان تارادەیەک پشتیوانی لە حکوومەتی هەرێمی کوردستان بکات و نەهێلێت کوردەکان کێشە دروست بکەن بۆ ئەوەی عێراق لە یەک هەڵنەوەشێتەوە.

ولاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا و یەکێتی ئوروپا هەمیشە وەک مەسەلەیەکی تایبەت بە ناوخۆی ولاتان و بە گوێرەی سیاسەتێکی پێناسەکراوی هاوبەش لەگەڵ مەسەلەکان هەڵسوکەت دەکەن. ولاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا وەک جۆرێک دۆست و هاوپەیمان سەیری حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەکات هەروەها کە بە هەمان شێوەش سەیری تورکیە دەکات. ئامریکا بە لەبەرچاوگرتنی بەرژەوەندیەکانی لە رۆژهەلاتی ناوەڕاست و هەروەها پرەنسیپەکانی مافی مرۆڤ و بەها دیموکراتیکەکان دەبێ بەڵێنەکانی بەنسبەت کوردەکان جێبەجێ بکات. کوردەکان لە کاتی هەر دوو شەڕی عێراقدا پشتیوانیان لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا کرد لە کاتێکدا کە ولاتانی دیکە وەک تورکیە پشتیوانیان لە ئامریکا نەکرد.

بە بۆچوونی من ئێستا ولاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا پشتیوانی لە سەربەخۆیی کوردەکانی عێراق ناکات، چونکە لەوە دەترسێت کە ئەم مەسەلەیە ببێتە هۆی ئەوەی ولاتانی دیکە وەک ئێران و تورکیە و ولاتانی عەرەبی کە هەموویان دژی سەربەخۆیی کوردەکانن، پەیوەندیەکانیان لەگەڵ

ئامریکا تێک بدەن، چونکە ئەم دەوڵەتانە وا بیر دەکەنەوە کە کردەوەیەکی وەها  کوردەکانی وڵاتانی دیکەش هان دەدات داوای سەربەخۆیی  بکەن .

کێشەی کورد گرنگیەکی ئەوتۆی بۆ ئاسایشی نەتەوەیی ئامریکا یا رەوتە دیمۆکراتیکەکان لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا نییە ، هەربۆیە ئامریکا و یەکێتی ئوروپا (پ.ک.ک) یان خستووەتە ناو لیستی رێکخراوە ترۆریستیەکان  و بە هەموو شێوەیەک پشتیوانی لە تورکیە دەکەن دژی (پ.ک.ک) خەبات بکات. کۆمەڵگای کورد لە دەرەوەی وڵات  کاریگەر و چالاک بووە  بەڵام هێشتا شتی زۆر ماوە بیکات. کوردەکان دەبێ یەکگرتوو بن و لە رێگای بەرێکخستنکردنی خۆیان لە دەرەوەی تورکیە پشتیوانی لە یەکدی بکەن و  لۆبیەکی گەورە و کاریگەر  هەم لە وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا و هەم لە ئوروپا و شوێنەکانی  دیکەی جیهان دروست بکەن .

**دەیڤید رۆمانۆ:** پێموانیە ئەمریکا  ئیستراتژی یا سیاسەتێکی تۆکمەی بۆ کورد بە گشتی هەبێت، بۆ نمونە کاتێک کە مەسەلەکە دێتە سەر  بزووتنەوەی (پ.ک.ک) ، ئەمریکا بە هەمان شێوەی دەوڵەتی تورکیا سەیری مەسەلەکە دەکات، هەرچەند کە هەندێ لە (هێزەکان) لە واشنگتون هەوڵ دەدەن و جارناجار گوشارێکی سنووردار دەخەنە سەر تورکیا تا سیاسەتێکی دیموکراتتر بۆ بەفەرميناسینی مافەکانی کەمینەی کورد بگرێتەبەر، بەڵام بەنیسبەت کوردەکانی عێراق، ئەمریکا زۆر مەمنوونە کە دۆستیکی متمانەپێکراوی

لە ناوچەکەدا هەیە، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەیەوێت پەیوەندی باشی لەگەڵ لایەنە غەیرە کوردەکانی عێراق هەبێت، ئەمە بەواتای ئەوەیە کە لەوانەیە ئەمریکا پشتیوانی لە سیاسەتگەلێک بکات کە بە قازانجی کوردستان نەبێت.

ئەمریکا و وڵاتانی دیکەی رۆژئاوا لە بەرژەوەندی خۆیاندا نابینن پشتیوانی لە کوردستانێکی سەربەخۆ بکەن. ئەوان چۆن لە ئاواتی خەڵکی ئیسراییل تێدەگەن ، بە هەمان شێوە لە ئاواتی گەلی کوردیش تێدەگەن بۆ ئەوەی دەوڵەتی خۆی هەبێت و لەگەڵ ئەم ئاواتە هاوسۆزن و هەروەها بەلەبەرچاوگرتنی کێشە مێژووییەکانیان لەگەڵ دەوڵەتی ئێران، عێراق و سوریا ، بوونی دەوڵەتێکی کورد زۆر بە قازانجی خۆیان دەزانن، بەڵام تەنانەت ئیسراییلیش بە هۆی پەیوەندییەکانی لەگەڵ تورکیا چالاکانە پشتیوانی لە شتێکی وا ناکات(هەرچەند بەلەبەرچاو گرتنی خراپبوونی ئەم پەیوەندییە لە سالی ٢٠٠٢ بەم لاوە، لەوانەیە هەڵوێستی ئیسراییل رۆژێ لە رۆژان بگۆڕدرێت). کاتێک کە مەسەلەی سەربەخۆیی کوردستان بێتە مەیدان، تورکیا، ئێران و گەلێ لە وڵاتانی عەرەب لە ناوچە، لە پشتیوانانی کوردەکان کاریگەری نێونەتەوەیی زیاتریان دەبێت.

بەدڵنیاییەوە ئەمریکا وەک هاوپەیمان یا دۆستێک سەیری حکومەتی هەرێمی کوردستان دەکات. بە تایبەت ئەو کاربەدەستە ئەمریکییانە کە لە کوردستانی عێراقدا بوونە، وەک دۆستێکی زۆر باش سەیری حکومەتی هەرێمی

کوردستان دەکەن، بەڵام ئەمریکییەکان نایانەوێت بکەونە ناو بارودۆخیک کە لە نێوان کوردەکان و عەرەبەکانی عێراقدا یەکێکیان هەڵبژێرن یا ناچار بن لە نێوان ئانکارا و هەولێردا یەکێکیان هەڵبژێرن. لەوانەیە ئەم هەڵبژاردنە بە قازانجی کوردەکان نەبێت بە هۆی سیاسەتە "ریبەلپۆلیتیکەکان" و کاریگەری و دەسەڵاتی زیاتری گەلێ لە دراوسێکانی کوردەکان.

لە کاتی ئیدارەی بوشدا، کوردستان پێگەیەکی زۆر گرنگ و یەکلاییکەرەوەی لە (رەوتی) بەدیموکراسیبوونی عێراق و سیاسەتی ئاسایشی ئەمریکا لە ناوچەدا هەبوو، بەڵام ئێستا زۆر زووە بۆ ئەوەی بڵێن ئیدارەی ئۆباما چون سەیری کێشەی کورد دەکات، باوەر ناکەم خۆشیان هیشتا لەسەر ئەم مەسەلەیە ساخببویەنەتەوە.

هەرچەند کە حکومەتی هەرێمی کوردستان ئێستا نوێنەرایەتییەکی باشی لە واشنگتن و گەلێ لە وڵاتانی دیکە هەیە، بەڵام لۆبی کوردی بە گشتی هێشتا بە بەراورد لە گەڵ لۆبی نەتەوەکانی دیکە(بۆ نموونە لۆبی ئەرمەنییەکان بۆ بە فەرمیناسینی ژینوسایدی ئەرمەنییەکان) زۆر لاوازە.

**ماریانا شرونتاکی:** کوردەکان وەک تەنها هێزی راگرتنی هاوسەنگی یەکپارچەیی عێراق (هەم لە رووی یەکپارچەیی سیاسی و هەم لە رووی یەکپارچەیی خاکەوە ) دەورێکی بەرچاو و گرنگ هەم لە سیاسەتەکانی عێراق و هەم سیاسەتی دەرەوەی وڵاتە یەکگرتوەکانی ئامریکا بەنیسبەت

عێراق دەگێڕن. لەوانەیە کوردەکانی عێراق پێویستیان بە ئامریکا هەبێ، بەڵام بە هەمان شێوەش سیاسەتی دەرەوەی ئامریکا پێویستی بە کوردەکان هەیە بۆ ئەوەی لەگەڵ پێکهاتەی سیاسی لەرزۆکی عێراق مامەڵە بکات، چونکە سیاسەتی دەوڵەتانی ناوچە ئێستا لەگەڵ سیاسەتی دەرەوەی ئامریکا هاوئاهەنگ نیە .

سیاسەتی دەرەوەی ئامریکا گرێدراوی راگرتنی هاوسەنگی ناوچە لەپێناو بەرژەوەندیەکانی ئامریکادایە و ئەمەش بۆتە هۆی زیاتربوونی پشتیوانی ئامریکا لە ئامانجەکانی کوردەکان. بەهەرحاڵ ئامریکا لە سیاسەتی دەرەوەی خۆیدا هیچ بەرنامەیەکی گشتی یا ئیستراتیژیەکی بۆ کوردەکان نیە، چونکە کوردەکان لە نێوان ٤ وڵاتی جیاوازدا دابەش کراون و هەرکام لەم دەوڵەتانە سیاسەتی تایبەتی خۆیان بە نیسبەت کوردەکان هەیە .

سەرەڕای ئەمەش ئامریکا بەنیسبەت بزووتنەوەی کورد لە هەرکام لەم وڵاتانەدا سیاسەتی نەرێنی ، ئەرێنی و بێلایەنی هەیە و ئەمەش لە چوارچێوەی سیاسەتی گشتی دەرەوەی رۆژهەڵاتی ناوەڕاستدایە، بەڵام تا ئەو شوێنە کە پەیوەندی بە ئوروپاوە هەیە، هەرچەند کە ئوروپا پشتیوانی لە ئامانجەکانی کوردەکان و مافی مرۆڤ و رەوتە دیمۆکراتیکەکان دەکات بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا ئوروپا هیچ ئیستراتیژیەکی روونی بۆ کورد نییە. هەر بۆیە ئوروپا سیاسەتی دەستێوەرنەدان لە کاروباری سیاسی وڵاتانی

دیکەی گرتووەتە بەر و زیاتر مەسەلەی ئابووری سیاسی بۆی گرنگە .

پرەنسیپی هاندانی دیمۆکراسی و ریزگرتن لە شوناسە ئەتنیکیەکان، ئامانجەکانی کوردەکان بە فەرمی دەناسێت، بەلام لە گەڵ ئەمەشدا ئەم سیاسەتە لە ژێر کاریگەری ئیستراتیژی درێژخایەنی ئامریکا بۆ راگرتنی هاوسەنگی هێزەکانی ناوچەدایە، کەوابوو زۆر دورە کە ئامریکا بەرژەوەندیەکانی سیاسەتی دەرەوەی خۆی لە پێناو ئامانجی سەربەخۆیی کوردەکاندا بخاتە ناو مەترسی مەگەر ئەوە کە پەیوەندیەکانی کوردەکان و ئامریکا بگاتە ئەو رادەیە کە بەرژەوەندیەکانی ئامریکا لە ناوچە ئاسان بکات .

بە بۆچوونی من کشانەوەی هێزەکانی ئامریکا لە عێراق لە ساڵی ۲۰۱۱ کاریگەریەکی ئەوتۆی لە سەر هەرێمی کوردستان و پەیوەندیەکانی ئامریکا و کوردەکان نابێت، چونکە بە پێی سەرچاوە ئامریکاییەکان، ئامریکا پشتیوانی لە ئەرکی خۆی بەنیسبەت ئاسایشی ناوچە دەکات. سەرنەکەوتنی ستراتیژی ئامریکا پاش سەدام و ترسی هێزەکانی ناوچە لە ئەگەری نەمانی تەبایی لە نێو گروپە سیاسیەکانی عێراق دەبێتە هۆی ئەوەی ئامریکا بەردەوام پشتیوانی لە عێراقیەکان بکات.

بە کورتی لە پێناو ئامانجی عێراقێکی یەکگرتوودا، سیاسەتی ئامریکا بەنیسبەت عێراق زۆر پشتی بە سەقامگیری باکووری عێراق بەستوە بۆ ئەوەی ناتەباییە ناوخۆیەکانی دەوڵەتی عێراق کۆنترۆڵ بکات. کەوابوو

کوردەکانی عێراق دەوری سەرەکی خۆیان لە سیاسەتی دەرەوەی ئامریکا لە داهاتودا رادەگرن. هاوکات کوردەکان بەرژەوەندیەکانی خۆیان پێش دەخەن و حکوومەتی هەرێمی کوردستان لە ئاستی ناوچە و نێونەتەوەییدا درێژە بە پێشخستنی سیاسەتی خۆی دەدات .

**توماس نابرسیۆ:** گرنگترین شت بۆ وڵاتە یەکگرتووەکانی ئامریکا وەک زلهێزی جیهان، سەقامگیریە. مەبەستم ئەوەیە کە ئەمریکا هێزێکی کۆنسیرڤاتیفە کە دەیەوێت کێشە و ناکۆکی نەبێت و نەهێڵێت هیچ وڵاتێک زۆر بەهێز بێت. لەمە زیاتر ئەمریکا دەیەوێت پەیوەندیە زۆر گرنگەکانی خۆی لەگەڵ وڵاتانی بیانی رابگرێت، بەڵام بەهەرحاڵ کێشەی کورد هەندێ جار ئەم مەسەلەیەی لە ئامریکا تێکداوە. بۆ نموونە سەرەڕای ئەو شتە کە بەڵگەنامەکانی ویکیلیکس نیشانی دەدات، واشینگتۆن گرنگیەکی یەکجار زۆر بەهاوپەیمانیەکەی لەگەڵ تورکیە دەدات. بەهەرحاڵ هەڵسوکەوتی خراپی لەمێژینەی تورکیە لەگەڵ کوردەکانی خۆی و ترسی تورکیە لە دروستبوونی کوردستانێکی سەربەخۆ بووەتە هۆی ئەوەی کە پەیوەندیە نزیکەکانی کوردەکان و ئامریکا دژوارتر بێت و ئەگەر ئەمریکا ناچار بێت لە نێوان کوردەکان و تورکیادا یەکێکیان هەڵبژیرێت بێگومان تورکیە هەڵدەبژیرێت. هەروەها دەوڵەتی تورکیە لەوە دەترسێت کە ئەو رێژە زیادە خودمۆختاریە کە کوردەکانی عێراق هەیانە کوردەکانی تورکیا هان بدات داوای هەمان شت لە تورکیا

بکەن(کە تورکەکان بەهیچ شێوەیەک قبوولی ناکەن) .
کەوابوو ئەم مەسەلەیە ئەوەی بۆ ئامریکا زۆر دژوار کردوە
کە خۆی زۆر لە ئامانجەکانی کوردەکان نزیک بکاتەوە،
تەنانەت ئەگەر بیشیەوێت .

بەهەمان شێوە ئەمریکا دەیەوێت عێراق وەک دۆستی ئەمریکا سەقامگیر و خۆشبژێو بێت، بەڵام کێشەکە ئەوە یە کە ئەم ئامانجە رۆژ بەرۆژ دژوارتر دەبێت. تەنها ئەم دوایانە بوو کە دەوڵەتی ئامریکا بۆی دەرکەوت نابێت پشت بەدەوڵەتێک لە بەغداد ببەستێت کە لەلایەن ئێرانەوە پشتیوانی لێدەکرێت و تێگەیشت کە زۆر زەحمەتە بارودۆخی ئاسایشی عێراق پتەو بێت. لەمە زیاتر هێزە دەرەکیەکان بەردەوام دەستێوەردان لە عێراق دەکەن و سیستمی سیاسی عێراقیان لەپێناو ئامانجەکانی خۆیاندا تێکداوە. ئەڵبەتە سەقامگیرترین شوێنی عێراق کوردستانە، بەڵام بەهەرحاڵ پشتیوانیکردن لەم دوورگە سەقامگیرە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەریان بەرەو جیابوونەوە لە عێراق لەلایەن ئەو هێزانەوە زیاتر بێت کە دەیانەوێت کیانی عێراق تێک بدەن و سەقامگیری سیاسی، کۆمەڵایەتی و ئابووری ئەو وڵاتە لەناو ببەن. کەوابوو ئەو ئیستراتژیە کە ئەمریکا لەپێناو بەرژەوەندیەکانیدا تا ئێستا لە عێراق پەیڕەوی کردوە(تەنانەت ئەگەر بێ سوودیش بێت) تەنیا ڕێگاچارەیە کە لە بەردەم ئامریکادایە. کەوابوو ئەگەر دەبینین ئەمریکا ئامانجگەلی نایەکانگیری هەیە شتێکی ئاساییە.

بـەو هۆکارانـــە کـــە باســـم کـــردن ئـــەمریکـــا پـــشتیوانی لەسەربەخۆیی کوردستان ناکات ، مەگەر بەو مەرجە کە عێراق و تورکیە بە سەربەخۆیی کوردستان رازی بن، بەڵام شتی واش مومکین نییە.

لـەوانـەیـە ئـەمریکـا هـەم وەک دۆست و هـەمیش وەک هاوپەیمان سەیری کوردەکان بکات، بەڵام بەهەرحاڵ ئەمە بەواتای ئەوە نیە و نابێت واش لێک بدرێتەوە کە ئەمریکا کوردەکان ناکات بە قوربانی بەرژەوەندیە نەتەوەیە گەورەتر و یەکلاییکەرەوەکانی خۆی کە هەندێکیان بریتین لە هاوپەیمانیەکەی لەگەڵ تورکیا ، سەقامگیری عێراق و پێشگرتن لە بالادەستبوونی ئێران بەسەر رۆژهەڵاتی ناوەراست و کەنداوی فارس. بەداخەوە کوردەکان لەناو کۆمەڵێک هاوکێشەی جوگرافی و ژئۆپلۆتیکیدا گیریان کردووە و لە نیوان سنووری سیاسی کۆمەڵێک دەوڵەتی گرنگدا دابەشبوونە کە هیچ کەس(جگە لە خودی کوردەکان) نایەوێت ئەم سنوورانە ئالوگۆڕی بەسەردا بێت، کەوابوو هۆکاری ئەوەی کە زلهێزی ئامریکا و هەموو زلهێزەکانی دیکە وا هەڵسووکەوت دەکەن هەر ئەوەیە.

لە پەیوەندی لەگەڵ سیاسەتی ئەمریکا بەنیسبەت کوردستانی تورکیە پێموایە ئەمریکا رێگە بەوە نادات کە مەسەلەی کوردستان پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورکیا تێک بدات مەگەر ئەوە کە تورکیا سیاسەتی خۆی بەتەواوی بگۆڕێت و خۆی لە رۆژئاوا دور بخاتەوە و خۆی لە جیهانی ئیسلام نزیک بکاتەوە، بەڵام ئەگەر ئەوە روو نەدات، پێموانیە هیچ

گۆڕانكاریەك ڕوو بدات كە قازانجێكی ئەوتۆی بۆ كوردەكانی توركیا تێدابێت .

مەسەلەی جدی بەنیسبەت پەیوەندییەكانی ئەمریكا و كوردەكان ئەوەیە كە مێژوو قەد لەگەڵ ئامانجی كوردەكاندا باش نەبووە. كوردەكان لەنێو ترازیدیایەكی ژئۆپلۆتیكی گەورەدا گیریان خواردووە. بەهۆی بڕیاری جیهانی دەرەوە كوردەكان لەنێوان كۆمەڵێك دەوڵەتی زۆر گرنگدا دابەش كراون واتا لەنیوان عەرەبەكان، فارسەكان و توركەكاندا. لە ئاكامدا هەموو ئەم دەوڵەتانە كوردەكانیان دژی دوژمنەكانی خۆیان بەكارهێناوە و یەكێتی كوردەكانیان تێكداوە و بارودۆخێكیان رەخساندوە كە تێیدا كوردەكان بوونەتە داردەستی بەرژەوەندی كەسانی دیكە و دەوڵەتەكان كەڵكیان لێوەرگرتوون و هەر كاتێك پێویستیان پێیاننەمابایا دستیان لەهەڵگرتوون. لەمەزیاتر بەهۆی هەڵكەوتی جوگرافیایی كوردستان، ئامانجە سیاسیەكانی كوردەكان وەك هەڕەشەیەكی راستەوخۆ بۆ یەكپارچەیی خاكی عێراق، ئێران و توركیە سەیر دەكرێت، لەئەنجامدا لە داهاتودا پشتیوانیەكی ئەوتۆ لە ناوچە لە كوردەكان ناكرێت.

بە كورتی، بە بۆچوونی من ئەمریكا و وڵاتانی ئوروپایی هیچ سیاسەتێكی تۆكمەیان بۆ كورد نییە. ئەم دەوڵەتانە ئیستراتژی و سیاسەتێكی درێژخایەن و ستانداردیان هەیە بۆ ئەوەی سەقامگیری ناوچە بپارێزن و پەرەی پێبدەن. سیاسەتی ئەوان بە نیسبەت كورد وایە واتا نایانەوێت سنوورەكانی عێراق و توركیا ئاڵوگۆڕی بە سەردا بێت و ئەم

ناتەبـــاییە لـە نێـــوان ســـەقامگیری نـــاوچە و مـــافی چـــارەی خۆنووسـین بـۆ کـورد هەمیـشە کـاریگەری نەرێنـی لـە سـەر کوردەکـان وەکـو نەتەوەیەک هەبـووە. هێـزە دەرەکییـەکـان ناچارن بەو شێوەیە هەڵسوکەوت لـەگـەڵ بارودۆخـەکـە بکـەن کـە لـە راستیدا هـەیـە نـە ئـەوە کـە پێیانخۆشـە بارودۆخـەکـە چـۆن بێـت. بـەرژەوەنـدی هێـزە بیانیـەکـان لـەوەدایـە کـە لەداهاتوودا پێش لـەسـەربـەخۆیی کوردستان بگرن ئـەگـەرنا بەرژەوەندیە گرنگەکانیان لەناو دەچێت.

**ژۆردی تێـژەل:** هەرچـەنـد کـە هـەر لـە سـەرەتای سـەدەی ٢٠وە هەنـــدێ کەس لـە نێـــو دەوڵەتـــانی ئـوروپـــایی و ئـەمریکـــا خـەمخـــۆری ئامـــانجی کوردەکـــان بـــوونە، بەڵام ئـەگـەر لـە روانـگـەی مێـژوویـەوە سـەیر بکـەیـن دەبینـین کـە ئـەمریکـا و وڵاتـانی رۆژئاوایی هیچ سیاسەت یا ئیستراتژیەکیان بۆ کـورد وەک نەتەوەیەک نەبووە. فەرانسە، بریتانیا و ئەمریکا زیاتر گرنگیـان بـە هاوسـەنگی هێزەکـانی نـاوچە و سـەقامگیری ئـەو وڵاتـــانە داوە کـە کوردەکـــان تیانـــدا دەژیـــن، ئـەڵـــبەتە ئـەم مەســـەلەیە بەهـــۆی ســـەرهەڵدانی دیاســـپۆرای کـــورد تـــا رادەیـەک ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە، چونکە دیاسپۆرای کـورد لـە هەنـــدێ رووەوە زۆر چـــالاک بـــووە. رەوتـــی پێـشکەوتنی یەکێتـی ئوروپـاش یـارمەتـی بـە هەڵسوکەوتکردنێکی جیـاواز لـەگەڵ مەسـەلەی کـورد داوە. پتەوبـوونی ئـازمونی هەرێمـی کوردسـتان وەک کیـانێکی نـیمچە سـەربەخۆ لەوانەیە ئـەو شێوە هەڵسوکەوتە زیاتر بگۆڕێت و باشتری بکـات. بەهەرحاڵ

ئەمە بە واتای ئەوە نییە کە سیاسەتێکی تۆکمە بەنیسبەت کورد وەک نەتەوەیەک لە ئارادایە .

**هاکان ئوزئوغڵوو:** سیاسەتی رۆژئاوا بەنیسبەت کوردەکان دوو رەهەندی هەیە: یەکەمین و گرنگترین رەهەندی ئەم سیاسەتە لە لایەن سیاسەتمەدارە رۆژئاواییەکان لە روانگەی بەرژەوەندی ئیستراتژیکەوە دادەرێژێت. کوردەکان وەکو کیانێکی گشتی گرنگییەکی زۆر ئەوتۆیان بۆ بەرژەوەندییەکانی رۆژئاوا لە سەدەی ٢٠ دا نەبوو، بەڵام ئەم بارودۆخە لە دوای هێرشی ئەمریکا بۆ سەر عێراق لە ٢٠٠٣ ئاڵوگۆڕی بەسەردا هاتووە. کوردەکانی عێراق ئێستا بوونە بە فاکتۆریکی پڕبایەخ و گرنگ و متمانەپێکراو بۆ بەرژەوەندییەکانی ئەمریکا لە ناوچە. رەهەندی دووەم ، مەسەلەی پێشێلکردنی مافی مرۆڤە لە لایەن ئەو وڵاتانەی کە کورد تێیاندا دەژین. ئەگەر لە روانگەی مێژووییەوە سەیر بکەین دەبینین کە نیگەرانی و هەڵسەنگاندنە مافی مرۆڤییەکان بەنیسبەت بارودۆخی دژواری کوردەکان هەمیشە بۆ بەرژەوەندییە ئیستراتیژیکەکانی رۆژئاوا لە پلەی دووەمی گرنگیدا بووە.

**جاناتان رەندیل:** خەڵکی ئەمریکا وەک شەڕێکی پڕ خەرجی هەڵە سەیری شەڕی عێراق دەکەن، هەرچەند کە هەندێ کەس وای لێکدەدەنەوە کە ئەم شەڕە سەرکەوتوو بووە. لە بیرمان نەچێت کە پاش شکستی ئەمریکا لە ڤییەتنام ، خەڵکی

ئەمریکا پێیان خۆش نەبوو بۆ ساڵەهای ساڵ هیچ شتێک سەبارەت بەو وڵاتە ببیسن. ئەمریکییەکان لە شەڕی عێراق بێزار بوونە، تەنانەت ئەگەر مەسەلەی نەوت ناچاریان بکات هێشتا خۆیان لە ناو کێشەکەدا بهێڵنەوە هەرچەند کە من پێموانییە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و ئەوروپا لە بنەڕەتدا خوازیاری نەوتی عێراق بن، زلهێزە سەرەکییەکانی دیکەش هەروا. لەبیرمان نەچێت کە بە ڕاست یا ناڕاست، شەڕی عێراق وەک فاکتەرێک سەیر دەکریت کە یارمەتی بە لاوازبوونی ڕێژەیی هێزی بێ وێنەی ئەمریکا و سەرهەڵدانی هێزی وڵاتی چین و هیند داوە، هەرچەند کە سەرهەڵدانی چین و هیند شتێکی مسۆگەر بوو، بەڵام بە هۆی شەڕی عێراق لە لایەن سەرۆک جۆرج بوشەوە ئەم ڕەوتە خێراتر بوو .

بە کورتی من گومانم لەوەدا هەیە کە ڕۆژئاوا سیاسەتێکی چڕوپڕی بە نیسبەت کورد وەکوو نەتەوەیەک هەبێت بە تایبەت ئەگەر مەبەست کوردەکانی سەراسەری ناوچە بێت. ترسی من ئەوەیە کە بە تایبەت وڵاتە یەکگرتووەکان پشت لە عێراق و کوردەکان بکات. ئەو بێزارییەی خەڵکی ئەمریکا لە شەڕی عێراق و کەمبوونەوەی ڕێژەیی دەسەڵاتی ئەمریکا لە ڕووی مەنتیقییەوە واتاکەی ئەوەیە کە توانایی واشنگتۆن بۆ کاریگەریدانان لە سەر ڕووداوەکانی داهاتوو کەم دەبێت و لەوانەیە (سیناریوی) پەیمانی سەعدئاباد (کە وڵاتانی دراوسێی کوردەکان لە ساڵی ١٩٣٧ دژ بە کوردەکان مۆریان کرد) دووبارە بێتەوە و ترسی کوردەکان هەر بەردەوام بێت. هەروەها دەبێ لەبیرمان بێت کە وڵاتە یەکگرتووەکان و

ئەوروپا لە مێژوودا بە دەگمەن هانی مافە سیاسییەکانی کوردەکانیان داوە.

**نوفرا بینگیو:** ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و وڵاتانی ئەوروپایی سیاسەتێکی روونیان بە نیسبەت نەتەوەی کورد بە گشتی نییە. لەم پەیوەندییەدا هەر دەوڵەتێک سیاسەتی خۆی هەیە. بە گشتی ئەم دەوڵەتانە وا بیر ناکەنەوە کە کوردەکان دەبێ مافی چارەی خۆنووسین یا دەوڵەتی خۆیان هەبێت. لە راستیدا ئەم دەوڵەتانە وەک شتێکی پیرۆز سەیری ئەو هاوکێشانە دەکەن کە پاش شەڕی یەکەمی جیهانی تا ئێستا بە سەر سیاسەتی ناوچەدا زاڵن و نایانەوێت ئەم هاوکێشانە بگۆڕدرێن. خاڵی ناتەبا ئەوەیە کە ئەم دەوڵەتانە مافی دامەزراندنی دەوڵەت بۆ فەلەستینیەکان بە ڕەوا دەزانن بەڵام بۆ کوردەکان بە ڕەوای نازانن، لە کاتێکدا کە گەلی کورد لە فەلەستینیەکان کۆنترە و نفوسیشیان زۆر لە نفوسی فەلەستینیەکان زیاترە. ڕاستییەکەی ئەوەیە کە کوردەکان بە پێچەوانەی فەلەستینیەکان لە رێکخراوگەلی نێونەتەوەیی وەک نەتەوە یەکگرتووەکان نوێنەریان نییە و ئەمەش بووەتە هۆی ئەوەی پێگەی کورد لە گۆڕەپانی نێونەتەوەییدا لاواز بێت.

بەنیسبەت مەسەلەی کورد وئیسراییل ، گەلی ئیسراییل زۆر هاوسۆزی گەلی کوردە، بەڵام دەوڵەتی ئیسراییل هیچ سیاسەتیکی تۆکمەی لەم پەیوەندییەدا نییە. لە رووی تیورییەوە لەوانەیە هیچ ناتەباییەک لە نێوان

پەیوەندییەکانی ئیسراییل و تورکیا لە لایەک و پەیوەندییەکانی ئیسراییل و کوردەکان لە لایەکی دیکەوە نەبێت، هەروەها کە تورکیا هیچ ناتەباییەک لە نێوان پەیوەندییەکانی خۆی لەگەڵ ئیسراییل لە لایەک و پەیوەندییەکانی لەگەڵ فەلەستینییەکان لە لایەکی دیکەوە نابینێت، هەمان شت بەنیسبەت پەیوەندییەکانی ئیسراییل و تورکیا و کوردەکانیش راستە. بەڵام لە ئاستی واقیعدا ئەم دوو شتە پێکەوە ناتەبان. ئیسراییل ناتوانێت دەوری ئاشتکەرەوە لە نێوان کوردەکان و دەوڵەتی تورکیادا بگێڕێت چونکە ئانکارا کێشەی کورد بە کێشەیەکی ناوخۆیی دەزانێت. بە گشتی ئەگەر ئیسراییل ناچار بێت لە نێوان بەرژەوەندییە ئیستراتژیکەکانی و نیگەرانی بۆ مەسەلە مرۆڤدۆستانەکان (لەوانە مافەکانی کوردەکان) یەکێکیان هەڵبژێرێت، بەرژەوەندی ئیستراتیژیکی خۆی هەڵدەبژێرێت. ئیسراییل و کوردەکان دەتوانن لە بوارگەلی جۆراوجۆری کولتووری و کۆمەڵایەتیدا دەست بە پەرەپێدانی پەیوەندییەکانیان بکەن. بە گشتی خاڵی هاوبەشی زۆر لە نێوان گەلی کورد و گەلی ئیسراییلدا هەیە کە دەکرێت لەم پێناوەدا کەڵکی لێوەربگیرێت.

**کارۆل پرۆنهۆبیر:** گرنگیدانی ئەمریکا بە کورد رۆژ بە رۆژ زیاتر دەبێت و ئەوە دەرفەتێکی گەورەیە بۆ کوردەکان بۆ ئەوەی ئیستراتیژی سیاسی خۆیان لەگەڵ ئەمریکا بەرەوپێش بەرن. ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا نایەوێ خۆی بخاتە

نێو کێشەی کوردەکانی تورکیە چونکە مەسەلەیەکی زۆر هەستیارە . بە هۆی ئەوەی دەوڵەتی تورکیە هاوپەیمانی سەرەکی ئەمریکایە ، ئەمریکا کوردەکانی تورکیە بە کوردە خراپەکان دەزانێت بەڵام کوردەکانی عێراق بە کوردە باشەکان دەزانێت. لەگەڵ ئەمەشدا تورکیە دەیەوێت پەیوەندیەکانی خۆی لەگەڵ دراوسێکانی پتەوتر بکات کە هەندێکیان بە تەواوی دژی ئەمریکان وەک ئێران، کەوابوو کوردەکان دەرفەتی ئەوەیان بەدەست هێناوە لە بۆشایی پەیوەندیەکانی نێوان واشنگتۆن و ئانکارا کەڵک وەربگرن . بەڵام کێشەی کوردەکانی ئێران هیچ کاریگەرییەکی راستەوخۆی لە سەر سیاسەتی دەرەوەی ئامریکا نییە، چونکە ئەمریکا زیاتر گرنگی بە مەسەلەی ناوکی ئێران دەدات. ئەمریکا دەیەوێت دەوڵەتی عێراق سەقامگیر بێت بۆ ئەوەی هێزەکانی ئەمریکا بە تەواوی تا کۆتایی ساڵی ٢٠١١ لە عێراق بکێشنەوە. سەرۆک ئۆباما بەڵێنی ئەوەی داوە و کوردەکان لە راستیدا بەشێکی گرنگی ئەو مەسەلەیەن. ئیدارەی ئەمریکا ئەوەی پشتڕاست کردووەتەوە کە بێ پشتیوانی کورد ئەو رەوتە سەرناگرێت و عێراق یەکگرتوو و سەقامگیر نابێت .

**پرسیار: سیاسەتی ئەمریکا بەنیسبەت کێشەی کەرکووك و ناوچە جێناکۆکەکان چییە؟**

**سین کان:** مەسەلەی کەرکووک و ناوچە جێناکۆکەکانی دیکە زۆر گرنگە. ڕێکنەکەوتن لەسەر سنووری باشووری کوردستانی عێراق ئەمڕۆ بوە بە سەرچاوەی سەرەکی نائارامی و ناسەقامگیری و لەوانەیە لە داهاتووشدا ببێ بە سەرچاوەی ناسەقامگیری و تەنانەت پێکدادان. ئیدارەی باراک ئۆباما پێیوایە ئەگەر ناکۆکییەکانی کورد و عەرەبەکان چارەسەر نەکرێت، دەبێتە مەترسیەکی گەورە بۆ سەقامگیری عێراق .

ئەمریکا سیاسەتی ئەوەیە کە ئەم کێشانە تەنها بە ڕێکەوتنی خودی عێراقیەکان چارەسەر بکرێت. ئەمریکا پشتیوانی لە هەوڵەکانی عێراقیەکان بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشانە دەکات، بەڵام زۆر دوورە کە بەرنامەی خۆی بخاتەڕوو. من لە سەر ئەو باوەڕەم کە لە داهاتوویەکی نزیکدا ئەمریکا لە پاڵ UNAMI دا بەغداد و هەولێر هان دەدات ڕەوتێکی سیاسی بۆ چارەسەرکردنی کێشە سەرەکییەکانیان بگرنەبەر. ئەگەر هەر دوو لا وا بکەن و لە سەر مەسەلە دژوارەکان وەک کەرکووک نەرمونیانی بنوێنن، ئەوکاتە ئەمریکا بە شێوەیەکی چالاک پشتیوانی لەو ڕەوتە دەکات و کۆمەڵێک دڵنیایی بۆ جێبەجێبوونی ڕێکەوتننامەکان دەخاتەڕوو، بەڵام ئەگەر وا نەبێت ڕێژەی تێوەگلانی ئەمریکا لەو مەسەلەیە ڕۆژ بە ڕۆژ کەمتر دەبێتەوە.

**دانییل سێرڤیر:** هیوادارم کە ڕێگاچارەیەك لە ئەنجامی وتوویژ بۆ کێشەی ناوچە جێناکۆکەکان، لەوانە کەرکووك بدۆزرێتەوە. کێشەی جیناکۆکەکان یەکێ لەو کێشە جیدییانەیە کە دەبێت لانیکەم تا رادەیەك چارەسەر بکرێت، پێش ئەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق پاشەکشە بکەن. ئەم کێشەیە لەم سالانەی دواییدا یەکێ لە کێشە گەورەکانی نێوان کورد و عەرەبەکان بووە و ئەمریکاییەکان فاکتۆریك بوونە کە هاوسەنگییان لەم پەیوەندییەدا راگرتووە. هاوکات لەگەڵ نزیکبوونەوەی کاتی دەرچوونی هیزەکانی ئەمریکا لە عێراق ئێستا زیاتر لە هەر کاتیکی دیکە پێویستە کە ئەم کێشەیە بە ناوبژیوانی ئەمریکا چارەسەر بکرێت.

نەتەوە یەکگرتووەکان هەوڵی زۆری داوە بۆ ئەوەی کێشەی کەرکووك چارەسەر بکات و تایبەتمەندییە مێژوویی و کولتوورییەکانی هەموو ناوچەکانی لە پێش چاو گرتووە و بەگشتی ڕێگاچارەی کێشەکەی خستووەتەڕوو، بەلام نەتەوە یەکگرتووەکان ئەو توانایی و دەسەلاتەی نییە کە لایەنەکان ناچار بە قبوولی ئەم ڕێگاچارەیە بکات و بە بۆچوونی من بۆ ئەوەی ئەم ڕێگاچارەیە جێبەجێ بێت پێویستە ئەمریکا پشتیوانی لەم ڕێگاچارەیەی نەتەوە یەکگرتووەکان بکات.

**رابێرت ئۆلسۆن:** ئەمریکا دەیەوێت کوردستانی عێراق ئۆتۆنۆمیەکی بەهێزی هەبێت. ئەمریکا هەروها پێویستی بەوەیە کە پەیوەندیەکانی لەگەڵ تورکیە باش رابگرێت، کەوابوو هەڵوێست و تیڕوانینەکانی واشینگتۆن بەنیسبەت کەرکووک و ناوچە جێناکۆکەکان هەروا ناڕوون دەبێت، چونکە ئەمریکا دەیەوێت هەموو لایەنەکان رازی بن. واشینگتۆن هیوادارە کە راستیەکان و سیاسەتەکانی کوردەکان و عەرەبەکان لەئاستی واقیعدا لە سەر بنەمای ئەو هەڵوێستە بێت کە ئامریکا لە داهاتوودا هەڵیدەبژێرێت. وادیارە ئەمریکا بەشوێن سیاسەتی بەڕێوەبردنی کێشەکاندایە بۆ ئەوەی لە رێژەی سەربازیچێتی خۆی لە عێراق کەم بکاتەوە. ئەگەر لە داهاتوودا پێشهاتەکان بەرەو دژمنایەتی یا توندوتیژی بچێت و ناکۆکی چەکداری لەنێوان کورد و عەرەبەکاندا سەرهەڵبداتەوە، واشینگتۆن خودی کوردەکان و عەرەبەکان سەرزەنش دەکات و دەڵێت : " ئیمە هیچمان لە دەست نایێت، ئەم خەڵکە(کورد و عەرەب) هەتا بووە هەر پێکەوە شەڕیان کردووە". ئەڵبەتە ئەمریکا ئیستراتیژی سەربازی و بنکە هەواڵگریەکانی خۆی لەعێراق هەر رادەگرێت بۆ ئەوەی لە سەرەوە چاودێری چونەدەرەوە و هاتوچۆی نەوت و گاز و هێڵی بۆڕی بکات کە نەوت و گازی عێراق دەگوازێتەوە بۆ دەرەوە. کەوابوو کێشەی کورد لە داهاتوودا لەچوارچێوەی ئەم هاوکێشە گەورەترە ژئۆپلۆتیکی و ژئۆئیستراتیژیەکانەدا شکڵ دەگرێت .

من پێموایە ئەمریکا وای پێ باشترە کە کێشەی کەرکووک زۆرتر لە ڕێگای نەتەوە یەکگرتووەکانەوە چارەسەر بکرێت. ئەمریکا پشتیوانی لە پێشنیارەکانی نەتەوەیەکگرتووەکان دەکات بۆ ئەوەی کوردەکان ، عەرەبەکان، تورکمانەکان و مەسیحیەکان لەناو شاری کەرکووک و ئەگەر بکرێت لە پارێزگای کەرکووک پێکەوە ڕێک بکەون و دەسەڵاتیان هەبێت. ئەمریکا لەوانەیە پشتیوانی لە گەڕانەوەی کەرکووک بۆ سەر هەرێمی کوردستان نەکات، چونکە ئەمە پەیوەندیەکانی ئامریکا و دەسەڵاتی بەغداد تێکدەدات. هەروەها لە قۆناخی یەکەمدا کاریگەری لەسەر پەیوەندیەکانی کوردەکان و عەرەبەکان لە ناوچە جێناکۆکەکان بەتایبەت پارێزگای نەینەوا دادەنێت . مەسەلەی دووەم ئەوەیە کە تورکیە پێی خۆش نییە کەرکووک بگەڕێتەوە سەر هەرێمی کوردستان و پشتیوانی لە سوننەکان دەکات. ئەم مەسەلەیە لە بەڵگەنامەکانی ویکیلیکسدا کە لەم دواییانە بڵاوبووەوە، بە روونی نیشان دراوە .

**واین وایت:** هاوکات لەگەڵ دەستپێکردنی ڕەوتی کشانەوەی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق ، دەوڵەتی ناوەندی ، دەزگای ئاسایشی عێراق ، حکومەتی هەرێمی کوردستان و هێزی پێشمەرگە دەبێ ئاگادار بن ناکۆکیەکان لە سەر مەسەلەی کەرکووک و ناوچە جیناکۆکەکان توندوتیژی لێنەکەوێتەوە .
بەنیسبەت ناکۆکیەکانی هەولێر و بەغداد و مەسەلەی کەرکووک ، ئەمریکا نایەوێت لایەنی هەولێر یا بەغداد

بگرێت، بەڵام بەهۆی بەرژەوەندیەکانی لەگەڵ دەوڵەتی بەغداد و تەنانەت دەوڵەتی تورکیە کە هاوپەیمانی ئەمریکایە لە ناتۆدا، ئەمریکا بەنیسبەت نیگەرانیەکانی بەغداد و تورکیە بێدەنگ نابێت. لەگەڵ ئەمەشدا بەهەرحاڵ هەمیشە لە ساڵانی رابردوودا هەندێ کەس لە ئاستی نافەرمی دەوڵەتی ئەمریکادا زۆر خەمخۆری کوردەکان و بارودۆخە دژوارەکەیان بوونە، کەوابوو ئەم لایەنەش وا لە ئەمریکا دەکات بەنیسبەت مەسەلەی کەرکووک و ناوچە جیناکۆکەکان هۆشیار بێت. بەهەرحاڵ دەبێ هەر دوولا بە جۆرە رێگاچارەیەک بگەن کە خۆیان بە زەرەرمەند نەزانن.

**ماریانا شرونتاکی:** ئامریکا نایەوێت بە شێوەی راستەوخۆ لەگەڵ مەسەلەی کەرکووک رووبەڕوو بێتەوە، بە تایبەت خۆی ناخاتە ناو هەوڵەکانی کوردەکان بۆ گەڕاندنەوەی کەرکووک بۆ سەر هەرێمی کوردستان کە کوردەکان وەک سەمبولی نادادپەروەری و سەرکووت و پێشێلبوونی مافی خۆیان سەیری دەکەن. هەرچەند کە سیاسەتی ئەمریکا ئەوەیە کە رێگاچارەیەکی سیاسی درێژخایەن بۆ کێشەی کەرکووک و ناوچە جیناکۆکەکانی دیکە بدۆزرێتەوە و لە رێگای تیمی ئاوەدانکردنەوەی کەرکووک (PRT)ژێرخانی ئابووری ئەو ناوچانە پێش بکەوێت و خەڵکی ئاوارەی کەرکووک بگەڕێنەوە سەر زیدی خۆیان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەڵوێستی ئەمریکا بەنیسبەت کێشەی کەرکووک بە گشتی ناڕوونە.

**جاناتان رەندیل:** من زۆر بە پارێزەوە بیروبۆچوونی خۆم بە نیسبەت مەسەلەی کەرکووک دەردەبڕم. پێشنیارە جۆراوجۆرەکانی نەتەوە یەکگرتووەکان و گروپی قەبرانی نێونەتەوەیی بۆ رێبەرایەتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و بیروڕای گشتی خەڵکی کوردستان هەزم ناکرێت. هیوادارم کە سازشێکی گونجاو لەسەر کەرکووک بکرێت بۆ ئەوەی کەرکووک نەبێتە بنبەستێکی سیاسی لە عێراق و نەبێتە هۆی ئەوەی ئەو پێشکەوتنە گەورەیە کە کوردەکانی عێراق و حکوومەتی هەرێمی کوردستان بەدەستیان هێناوە لەبار بچێت.

**لیام ناندیرسۆن:** حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت خۆی یەکلایی بکاتەوە کە بەراستی کەرکووک چەندە بۆی گرنگە؟ ئەگەر کەرکووک بۆ کورد کێشەیەکی چارەنووسساز و یەکلاییکەرەوەیە ، کەوابوو رێبەرانی کورد دەبێت هەڵوێستی سیاسی زۆر توند بگرنەبەر و تا کاتێك کە هەندێك ئیمتیازی باش بۆ مەسەلەی کەرکووک بە دەست نەهێنن، لەگەڵ حکوومەتی ناوەندی هاوکاری نەکەن و ئەگەر سەرەنجام ئەمەش سەری نەگرت دەبێت ئیمزای ١٠%ی خەلکی کەرکووك کۆ بکەنەوە و ریفراندۆمێك لە کەرکووك بەڕێوە ببەن، بەڵام ئەگەر کەرکووك بۆ حکوومەتی هەرێمی کوردستان گرنگە، بەڵام یەکلاییکەرەوە نییە، ئەو کاتە رێبەرانی کورد دەبێت مامەڵە بکەن و لە بەرامبەر وەرگرتنی پووانێکی بایەخدار، کونترولی کەرکووك بدەنە

دەستی حکوومەتی ناوەندی. حکوومەتی هەرێمی کوردستان تا ئێستا وەك مەسەلەیەکی یەکلاییکەرەوە لەگەڵ کێشەی کەرکووك هەڵسوکەوتی کردووە، بەڵام نەیتوانیوە کەرکووك بگەڕێنێتەوە سەر کوردستان.

**ئۆفرا بینگیو:** لە راستیدا مەسەلەی کەرکووك (بۆ کوردەکان)مەسەلەیەکی گرنگە، بە هەمان شێوە کە قودس بۆ ئیسراییل و عەرەبەکان و جیهانی ئیسلام گرنگە. من بۆ خۆم پێموایە دەبێ رێگایەك بۆ سازش لە سەر مەسەلەی کەرکووك بدۆزرێتەوە. ناوچەکانی دیکەی کوردستان لە رووی نەوتەوە دەوڵەمەندن کەوابوو لە رووی ئابووریەوە حکومەتی هەرێمی کوردستان زۆر زەرەر ناکات ئەگەر رێگایەك بۆ چارەسەربوونی کێشەی کەرکووك بدۆزرێتەوە. لە رابردوودا شەڕێکی دوورودرێژ لە سەر کەرکووك کراوە و وادیارە خودی کوردەکانیش ئێستا زۆر بە پارێزەوە هەڵسوکەوت دەکەن بۆ ئەوەی شەڕێکی دیکە هەڵنەگیرسێت. راستە کە هێزی سیاسەتکردنی کوردەکان ئێستا زۆر لە رابردوو باشترە، بەڵام هێشتاش پێویستیان بەوەیە کە لەگەڵ بەغداد رێك بکەون. هەروەها کە وتەیەکی عەرەبی دەڵێت: "ئەوەت دەدەنێ وەری بگرە ، پاشان داوای شتی زیاتر بکە."

**توماس نابرسیۆ:** بەرژەوەندی سەرەکی ئامریکا سەقامگیری عێراقە و بەهۆی ئەوەی کە گەڕانەوەی کەرکووک بۆ سەر هەرێمی کوردستان رێگاچارەیەکی باش نییە بۆ چارەسەربوونی کێشەی کەرکووک(و مەسەلەی دابەشکردنی داهاتی نەوت) ئەمریکا دەیەوێت بڕیاردان لەسەر گەڕانەوەی کەرکووک بۆ هەرێمی کوردستان وەدوا بخات. لەم پەیوەندیەدا ئەمریکا بیر لەم رێگا و ئەو رێگا ناکاتەوە بۆ ئەوەی کێشەی زیاتر دروست نەبێت. سەقامگیرترین شوێنی عێراق کوردستانە، بەلام بەهەرحاڵ پشتیوانیکردن لەم دوورگە سەقامگیرە دەبێتە هۆی ئەوەی کە بەریان بەرەو جیابوونەوە لە عێراق لەلایەن ئەو هێزانەوە زیاتر بێت کە دەیانەوێت کیانی عێراق تێک بدەن و سەقامگیری سیاسی، کۆمەلایەتی و ئابووری ئەو ولاتە لەناو ببەن.

**گونەش تەزجور :** روونە کە کێشەی سەرەکی نێوان هەولێر و بەغداد مەسەلەی کەرکووك و نەوتەکەیەتی. بە بۆچوونی من هیچ رێگاچارەیەکی ئاسان و خێرا بۆ کێشەی کەرکووك بوونی نییە، بەلام پێموانییە مەسەلەی کەرکووك ببێتە هۆی سەرهەڵدانی شەڕی چەکداری لە نیوان کوردەکان و دەوڵەتی بەغداد. بەهەرحاڵ بەلەبەرچاو گرتنی ئەو هێز و لایەنانە کە دەستیان لەم کێشەیەدا هەیە(بۆ نموونە ئێران، تورکیا و ئەمریکا) لەوانەیە هەر دوو لا لە درێژخایەندا لە سەر ئەم مەسەلە سازش بکەن. بەنیسبەت مەسەلەی کەرکووك پێموانییە حکوومەتی هەرێمی کوردستان پێویستی بە

مۆچیاری و پێشنیار هەبێت، چونکە خۆیان واقعبینن و ئەو توانایانە هەیە کە سیاسەتێکی ئیستراتیژیك بۆ بەدەستهێنانی بەشی کورد لە نەوتی کەرکووك بگرنە بەر.

**هاکان نوزنوغلوو :**کێشەکە ئەوەیە کە گەلێك هێز و لایەنی ناوخۆیی، ناوچەیی و نێونەتەوەیی لە کێشەی کەرکووکدا دەستیان هەیە و هیچکام لە لایەنە ناوخۆییەکان(عەرەبە سووننە و شیعەکان) و هێزە ناوچەییەکان(تورکیا، جیهانی عەرەب و بەتایبەت ئێران) و کۆمەڵگای نێونەتەوەیی (وەك دەوڵەتانی روسیا، چین ، یەکێتی ئەوروپا و ئەمریکا) لە سەر داهاتووی کەرکووك هاوڕا نین . هەروەها کە مێژوو نیشانی داوە، ئاڵوگۆڕ لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەمیشە بە گوشاری دەرەکی دروست دەبێت . بە واتایەکی دیکە، بۆ دروستبوون و بەردەوامبوونی ئاڵوگۆڕێکی سیاسی لە رۆژهەڵاتی ناوەڕاست، کوردەکان پێویستیان بە هاوپەیمانی ناوچەیی و نێونەتەوەیی هەیە.

**دەیڤید رۆمانۆ :** ئەمریکا ڕایگەیاندووە هەم لە مادەی ١٤٠ و هەم لە مادەی ١٤٢ پشتیوانی دەکات، بەڵام ئەم دوو مادە پێکەوە ناگونجێن، کەوابوو هەڵوێستی ئەمریکا بە هیچ شێوەیەك گەرانتی نییە بۆ کوردەکان. کوردەکان دەبێ لە سەر جێبەجێبوونی مادەی ١٤٠ پێداگری بکەن. گرنگترین دەستکەوتێك کە کوردەکان ئەم دواییانە بە دەستیان هێناوە ئەوەیە کە بڕیارە سەرژمێرییەك لە سەرانسەری عێراقدا

بەڕێوە بچێت. کوردەکان نابێت لەمەزیاتر لەسەر بەڕێوەچوونی ئەم سەرژمێرییە سازش بکەن یا لەمە زیاتر وەدواوە بکەوێت چونکە ئەنجامی ئەم سەرژمێرییە نیشان دەدات کە زۆربەی خەڵکی پارێزگای تەئمیم (کەرکووك ) کوردن و ئەمەش دەبێتە پاڵپشتییەکی گەورە بۆ گەڕانەوەی کەرکووك بۆ سەر هەرێمی کوردستان.

**کارۆل پرۆنهۆبێ:** وڵاتی عێراق لەگەڵ ناکۆکی تایفی رووبەڕوویە و کێشەکانی کورد- عەرەب چارەسەر نەکراوە. وادیارە نە شیعەکان و نە سوننەکان لە راستیدا نایانەوێت کوردەکان خۆیان کاروباری خۆیان بەڕێوە ببەن و دژی ئەوەن کۆنترۆڵی سەرچاوەکانی نەوتی کوردستان لە دەستی خودی کوردەکاندا بێت .

بە بۆچوونی من دەرچوونی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق بە واتای نەمانی هاوپەیمانیەکە کە زامنی پاراستنی ئاشتی حکومەتی هەرێمی کوردستانە. دەرچوونی هێزەکانی ئەمریکا لە عێراق نەتەنها بۆ کوردەکان، بەڵکو بۆ شوێنەکانی دیکەی عێراق کێشە ساز دەکات، چونکە دەستتێوەردانی وڵاتانی دراوسێ لە کاروباری عێراق رۆژ بەرۆژ زیاتر دەبێت کە دژی عێراقێکی سەقامگیر ، دیموکرات و بەهێزن.

بە هۆی هەوڵەکانی ئێران بۆ کاریگەریدانان و کۆنترۆلکردنی داهاتووی عێراق، بەرژەوەندی ئەمریکا لەوەدایە بە ئیستراتیژی خۆی بەنیسبەت کوردستان پابەند بێت.

ئامریکا نایەوێت ناوچە جێناکۆکەکان نائارام بێت و لایەنگری وتوویژ بۆ ڕێکەوتن لە سەر سنووری ئەو ناوچانەیە. ئەمریکا دەیەوێت ڕێبەرایەتی کوردستان بەنیسبەت مەسەلەی کەرکووک بە واقعبینی و بە کردەوە سیاسەت بکات. وادیارە ئەگەر مەسەلەکە گەورە بێتەوە، ئەمریکا لایەنی عەرەبەکان دەگرێت نە کوردەکان ، مەگەر کوردەکان زیرەک بن و بارودۆخەکە بەتەواوی کۆنترۆڵ بکەن.

**پرسیار: پێشنیاری نیوە بۆ ڕێبەرایەتی حكوومەتی هەرێمی كوردستان چییە؟**

**مایكیل گەنتەر:** حكومەتی هەرێمی كوردستان دەبێت هەوڵ بدات ئەو مافی دیموكراسی و فدراڵیزمە كە بەو هەموو زەحمەتییە لە یاسای بنەڕەتی عێراق لە گەلاڕێزانی ٢٠٠٥دا بە دەستی هێناوە بپارێزێت. هەروەها كوردەكان دەبێ پشتیوانی لە خواستی توركیا بۆ چوونە ناو یەكێتی ئەوروپا بكەن، چونكە ئەمە ڕیگایەكە بۆ دیموكراتیزەبوونی توركیا و یارمەتی دەدات بە چارەسەربوونی كێشەی كورد لەو وڵاتە. لە هەمان كاتدا كوردەكان دەبێ ئاگایان لە سنووری كردەوەكانیان بێت و پێی خۆیان زۆر درێژ نەكەن بۆ ئەوەی ئەو مافە نوێیانە لە كیس نەدەن كە ئەم دواییانە بەو هەموو زەحمەتییە بە دەستیان هێناوە. زانینی ئەوەی كە ئەم هاوسەنگییە بە ڕاستی لە كوێدایە پەیوەندی بە زیرەكی ڕێبەرایەتی كوردەوە هەیە. كوردەكان دەبێ ئەوە بزانن كە لە خەباتە بەردەوامەكەیاندا، دۆستی زۆریان لە ڕۆژئاوا هەیە.

**توماس ئابریسیۆ:** من تەنها پێشنیارێكی سادەم هەیە ئەویش ئەوەیە كە هەمیشە لە عێراقدا خۆتان وەك هێزێكی میانەڕەو و مەنتقی نیشات بدەن ، هەمیشە با داواكاریەكانتان مەنتقی و ڕەوا بێت و بەشێك بن لە چارەسەری نە دروستكردنی كێشە. ئەم هەنگاوانە لە كاتی مامەڵەكردن لەگەڵ كۆمەڵگای نێونەتەوەیی و بەتایبەت لەگەڵ ویلایە تە یەكگرتووەكانی

ئەمریکادا یارمەتیدەرتان دەبێت. هەڵگرتنی هەنگاوگەلێك وەك راگەیەندنی سەربەخۆیی بەشێوەی یەکلایەنە، خستنەرووی داواکاریگەلی نامەنتیقی و ئەوە کە کوردەکان وەك کەند و کۆسپێك بۆ سەقامگیری ناوچە سەیر بکرێن، خراپترین شتێکە کە کوردەکان لەوانەیە دەرحەق بە خۆیان بیکەن.

**مایکێل ئوهانلۆن:** عێراق هێشتا لە بارودۆخێکی زۆر هەستیار و لەرزۆکدایە و ئەگەری پەرەسەندنی توندوتیژیەکان هێشتا لە ئارادایە. ساڵی ٢٠١٠ ساڵێکی ئەرێنی بۆ عێراق نەبوو. رکابەریە سیاسیە درێژخایەنەکان بۆ پێکهێنانی دەوڵەتی نوێ کۆمەڵێک پرسیاری گەورەی دەربارەی دیموکراسی لە عێراق و توانایی رێبەرانی عێراق بۆ هاوکاریکردنی یەکدی لەپێناو بەرژەوەندیە گشتیەکانی وڵات هێنایە ئاراوە. کۆمەڵێک مەسەلەی گرنگ وەک کێشەی ناوچە جێناکۆکەکانی باکوور و دابەشکردنی داهاتی سەرچاوە سروشتیەکان هێشتا چارەسەر نەکراوە .

گرنگ ئەوەیە هەموو لایەنەکان پێکەوە سازش بکەن. دۆستانی عێراق دەبێ لەوە تێبگەن ئەگەر پرۆژەی دروستکردنی عێراق بە شێوەیەک لە شێوەکان سەرنەکەوێت، هێزەکانی ئامریکا ناگەرێنەوە بۆ عێراق بۆ ئەوەی بارودۆخەکە باش بکەنەوە و دۆستانی کوردی ئیمەش دەبی لەم رەوتەدا بەشداری بکەن بۆ ئەوەی پێش لە قوڵتربوونەوەی زیاتری ناکۆکیە گروپی و سیاسیەکانی

عێراق بگیرێت. من دڵنیام کوردەکان  توانایی ئەوەیان هەیە ئەو دەورە بگێڕن .
ئێمەی  ئامریکایی  دەسخۆشی لە کوردەکان دەکەین، بەڵام لە هەمان کاتیشدا دەمانەوێت عێراق سەقامگیر  و یەکپارچە بێت و هێزەکانمان بگەڕێنەوە بۆ ئامریکا. کەوابوو نامانەوێت بە مانۆڕ و ئیحساسات کار بکەین. ئێمە داوا لە دۆستە کوردەکانمان دەکەین  لە رەوتی سازش بۆ چارەسەرکردنی ناکۆکیەکان  لەگەڵ شوێنەکانی دیکەی عێراق بەشداری بکەن بۆ ئەوەی وڵاتی عێراق سەقامگیرتر بێت. بەرهەم  ساڵح  بۆ ئامریکاییەکان کەسایەتییەکی ناسراوە و زۆر رێزی لێدەگرن  چونکە وەک سیاسەتمەدارێک سەیری دەکەن کە  بەرژەوەندی هەموو عێراق لە بەرچاو دەگرێت  و بەشوێن رێگاچارەگەلی نەرم و لۆژیکدا دەگەڕێت.

**سین کان:** بارودۆخی عێراق بەگشتی ناڕوونە، چونکە هێزەکانی ئەمریکا خەریکن لە عێراق دەچنە دەرەوە. ئێستا کۆمەڵێک کێشەی بەرچاو لە نێوان دەوڵەتی فدراڵی عێراق و حکوومەتی هەرێمی کوردستاندا هەیە، لەوانە رێکەوتننامەکانی نەوت و مەسەلەی ناوچە جێناکۆکەکان. ئەوە کە ئەم کێشانە چۆن چارەسەر دەبێت پەیوەندی بەوەوە هەیە کە ئایا کوردەکان دەتوانن بوار بۆ پێشکەوتنی سیاسی خۆیان لە ٢٠ ساڵی داهاتوودا  ئامادە بکەن.
به بۆچوونی من چوونەدەرەوەی هێزەکانی ئامریکا لە عێراق کاریگەری لە سەر بارودۆخی ئیستراتژیکی هەرێمی کوردستان

دەبێت،چونکە بوونی درێژخایەنی سەربازانی ئەمریکا لە عێراق یارمەتی بە ئاسایشی ئەو وڵاتە دەدات . ڕێبەرایەتی کورد دەورێکی زۆر ئیستراتیژیکی لە شەڕی ئەمریکا و عێراق لە ۲۰۰۳دا بینی و دەوری زۆر گرنگ لە بارودۆخی عێراقی دوای پاشەکشەی هێزەکانی ئەمریکا دەگێڕێت بۆ ئەوەی دەستکەوتەکانی رابردووی پتەو بکاتەوە.

تا ئەو شوێنە کە پەیوەندی بە شێوەی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەمریکا لە داهاتوودا هەیە تەنها موچیاری من بۆ حکوومەتی هەرێمی کوردستان ئەوەیە کە زۆر ئاگاداری ئەوە بێت کە پێگەی عێراق و کێشەی کورد لە سیاسەتی دەرەوەی ئەمریکا ئاڵوگۆڕی بەسەردا دێت. ئەمریکا دەیەوێت یارمەتی بە چارەسەربوونی کێشەکانی نێوان بەغداد و هەولێر بدات و پێش لە دووپاتبوونەوەی تراژیدیاکانی رابردوو بگرێت. لەگەڵ ئەوەشدا ڕێبەرانی ئەمریکا ئێستا بە شێوەی ٤ ساڵ لەمەو پێش سەیری روداوە سیاسیەکانی عێراق ناکەن. لە ئەنجامدا بڕیار و کردەوە سیاسیەکانی حکوومەتی هەرێمی کوردستان ڕۆژ بە ڕۆژ گرنگی زیاتر لە سەر ئەو مەسەلەیە دادەنێت کە پەیوەندیەکانی کورد و ئەمریکا لە درێژخایەندا چۆن دەچێتە پێش.

**دەیڤید ڕۆمانۆ:** پێشنیاری من ئەوەیە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان و ڕێبەرانی کورد لە سەرانسەری جیهان تا ئەو شوێنە کە پێیان دەکرێت لە بواری ڕاگەیاندندا (وەك بەڕێوەبردنی کۆنفرانس و بەرهەمهێنانی فیلم و هاندانی

توێژینەوە و لێکۆڵینەوەی زانستی و ئاکادمیک) کار بکەن ب
ئەوەی خۆیان زیاتر بە جیهان بناسێنن. ئەگەر زانیاری
خەڵکی جیهان دەربارەی گەلی کورد و میژوو
کولتوورەکەیان زیاد بێت کوردەکان دڵنیا بن کە قەد جارێکی
دیکە (بە تایبەت کاتێك کە ئەوانەی کە دەسەلاتیان ب
دەستەوەیە پێکەوە دادەنیشن و هەوڵ دەدەن لەسە
هاوکێشە نێونەتەوەییەکان بڕیار بدەن) فەرامۆش ناکرێن.

**رابێرت نولسۆن** :رێبەرایەتی کورد لە هەرێمی کوردستان ل
ژێر گوشارگەلی (دەرەکی) گەورەدایە و لەگەڵ کێشەی زۆ
رووبەڕوویە. بە بۆچوونی من قازانجی حکومەتی هەرێمی
کوردستان لەوەدایە تا ئەو شوێنە کە پێی دەکرێت لەگەڵ
ئەمریکا و لەمەو بەدواش لەگەڵ دەوڵەتی بەغداد هاوکاری
بکات. بەهەرحاڵ ئەگەر ئەم هاوکارییە بەو ئەنجامە نەگات
کە کوردەکان دەیانەوێت،ئەو کاتە بو مسۆگەربوونی مانەوە
گەشەکردنی مافی ئۆتۆنۆمی خۆیان،کوردەکان دەبێت
سەرنجی زیاتر بە بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیا
بدەن وزیاتر پشتیوانی لێ بکەن.حکومەتی هەرێمی کوردستان
کاردانەوەیەکی ئەوتۆی لە بەرامبەر داخستنی DTP نەبوو
گرنگ ئەوەیە کە حکومەتی هەرێمی کوردستان یارمەتی ب
لاوازبوونی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد لە تورکیا نەدات
ئەگەرنا پێگە و هەڵوێستی لە بەرامبەر دەوڵەتی بەغدا
لاواز دەبێت هەروەها حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت
زۆر بە دیقەتەوە لەگەڵ ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا

مامەڵە بکات، چونکە ئەمریکا لە٢ یا سێ دەیەی داهاتوودا ئەوەندە کە گرنگی بە مەسەلەی نەوت و گازی عێراق دەدات، ئەوەندە گرنگی بە کێشە سیاسییە ناوخۆییەکانی عێراق نادات، هەر بۆیە پشتیوانی لە بەهێزتر بوونی (دەوڵەتی ناوەندی) عێراق دەکات. حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێت زۆر بە دیقەتەوە مامەڵە لەگەڵ ئەم کێشانەدا بکات.

**واین وایت:** پێویستە لە سەرانسەری عێراق، لەوانە لە نێو حکومەتی هەرێمی کوردستاندا کەسایەتی و فکری نوێ لە ئاستی رێبەرایەتیدا سەرهەڵبدات. یەکێ لە نیگەرانییە سەرەکییەکانی واشنتۆن ئەوەیە کە فورمولێک بدۆزرێتەوە بۆ ئەوەی عێراق بە یەکگرتوویی بمێنێتەوە و بۆ گەیشتن بەو ئامانجە دەبێ هەموو لایەنەکان پێکەوە سازش بکەن. لەوانەیە هەندێ دەنگی نارەزایەتی و تۆندئاژۆیانە لە نێو هەموو لایەنەکاندا هەبێت کە دژی ئەو سازشە بن، بەڵام ئەو رێگاچارانە کە ئەو کەسانە داوای دەکەن زۆر مەترسیدارە .

**دانییل سیرڤیر:** بە بۆچوونی من، بەشداری کورد لە حکوومەتی نوێی عێراق یەکلاییکەرەوەیە ، هەرچەند کە لەوانەیە ئاست و شێوەی بەشداری کورد پاش هەڵبژاردن لەگەڵ ئەوەی ئەمرۆدا جیاواز بێت . هێزە سیاسیەکانی کورد دەبێ لەگەڵ هەر هێزو لایەنێك کە لە شوێنەکانی دیکەی عێراق لە هەڵبژاردندا سەربکەوێت، وتوویژ بکەن بۆ ئەوەی دەوری راستەقینەی کورد مسۆگەر بکەن.

بەغداد دەیەوێت دەسەڵاتی زیاتری بە سەر هەرێمی ئۆتۆنۆمی کوردستاندا هەبێت. زۆربەی کوردەکانیش لە کۆڕوکۆبوونەوە تاکەکەسیەکانی خۆیاندا دەڵێن"بۆ دەبێت ئێمە بەشێك بین لە عێراق ؟بۆ نابێ سەربەخۆ بین ؟". بەڵام بارودۆخی ژیئۆپلۆتیکی بە شێوەیەکە کە رێبەرایەتی کورد بڕیاری داوە جارێ، بە ناویش بێت، لە ناو عێراقدا بمێنێتەوە. بەهەرحاڵ پەیبردن بە ئامانجی کۆتایی کوردەکان کاریکی زەحمەتە و دیار نییە کە ئایا زۆربەی کوردەکان دەیانەوێت لە عێراقدا بمێننەوە یا نا؟. جگە لەمە کێشەی دیکە ئەوەیە کە کوردستان کام ناوچەکانی عێراق دەگرێتەوە. دەستووری عێراق بەنیسبەت هەندێ مەسەلە شەفاف نییە و لە ئەنجامدا، بۆ نموونە چوارچێوەی خاکی کوردستان بە شێوەیەکی شەفاف لە دەستووردا چارەسەر نەکراوە. هەروا ئەوە کە دەسەڵاتی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و حکوومەتی بەغداد چییە، لە دەستووردا بە روونی دیاری نەکراوە .

ئەمە یەکێ لە کێشە گەورەکانە، چونکە ئەگەر تەنانەت وایدابنێین کە هەرێمی کوردستان وەك بەشێك لە عێراق بمێنێتەوە، کوردەکان داوای ناوچەگەلێك دەکەن کە لە دەرەوەی سنوورەکانی ئێستای هەرێمی کوردستانە و ئەمە مەسەلەیەکە کە گرووپی قەیرانی نێونەتەوەیی وەك "خاڵی کۆتایی" ناوی لێبردووە. ئەمریکاییەکان دەوری سەرەکییان لە راگرتنی ئەم هاوسەنگییەدا بینیوە و رێگەیان لەوە گرتووە

کە پەیوەندییەکانی کورد و عەرەبەکان لەوە زیاتر ئاڵۆز بێت.

**کارۆل پرۆنهۆبێر:** بە پێچەوانەی بەشەکانی دیکەی عێراق ، حکومەتی هەرێمی کوردستان، کوردستانی کردوە بەناوچەیەکی ئەمن و سەرکەوتوو و کوردستان درێژە بە پێشکەوتنی خۆی دەدات. بەرپرسیارێتی حکومەتی هەرێمی کوردستان بۆ حکومەتداریەکی باش و شەفافیەتسازی هەنگاوێکی زۆر گرنگە .

کوردەکان نیشانیان داوە دەورێکی گرنگ لە راگرتنی یەکپارچەی خاکی\عێراق دەگێرن . حکومەتی هەرێمی کوردستان دەبێ هاوسەنگیەک لە نیوان مافە بێ ئەم لاولاکانی نەتەوەی کورد و مافی فیدرالیزم بەگوێرەی یاسای بنەرەتی عێراق رابگرێت و لەگەڵ دەوڵەتی ناوەندیدا کار بکات. حکوومەتی هەرێمی کوردستان هەروەها دەبێ درێژە بە پەیوەندیە چالاک و گەشاوەکانی لەگەڵ ئامریکا هەم لە رووی سیاسی و هەم لە رووی بازرگانیەوە بدات .

**هاکان نوزئوگلوو:**حکومەتی هەرێمی کوردستان باش دەزانێت کە لەوانەیە زلهێزەکان خێراتر لە هێزەکانی ناوچە ، ئاقاری وەفادارییەکانیان بگۆڕن. دروستکردنی هاوپەیمانی لەگەڵ هێزێکی ناوچەیی لە درێژخایەندا زۆر بۆ حکوومەتی هەرێمی کوردستان گرنگە. بە بۆچوونی من تورکیا ئەو پوتانسییەلەی تێدایە کە ببێت بە باشترین هاوپەیمانی ناوچەیی حکوومەتی هەرێمی کوردستان و هەردوو لاش ئەمە

باش دەزانن. ئەم شتە لەوەدا دیارە کە کۆمپانیاکانی تورکیا لە هەرێمی کوردستان سەرمایەگوزاری زۆریان کردووە و ئەم دواییانەش کۆمەڵێك پەیوەندی سیاسی لە ئاستی جۆراوجۆردا لە نێوان تورکیا و حکومەتی هەرێمی کوردستاندا دروست بووە. بە بۆچوونی من بەفەرمیناسینی هاوپەیمانییەکی دوو لایەنەی وەها کە بە قازانجی هەردوو لایە، هەنگاوی یەکەمی چارەسەربوونی کێشەی کوردە لە ناوچە. هیچ گومان لەوەدا نییە کە بەشداری تەواوی کوردەکان لە نێو ئەو ولاتانەی کە تێیدا دەژین ،لە رادەبەدەر گرنگە. پێکهاتەی جوگرافیایی و کولتووری ناوچە وا حوکم دەکات کە تورك، کورد، عەرەب، ئەرمەنی، ئاسووری و گرووپەکانی دیکە پێکەوە بژین، با هەر کامیان پێکهاتەی ئیداری و سیاسی خۆیشیان هەبێت. پێداگرتن لە سەر یەك شووناسی ئایینی و ئەتنیکی وەك بنەمای حکومەت زۆر زیان بە پێکەوەژیانی هاوولاتیان یا دەوڵەتانی دراوسێ دەگەیەنێت. کەوابوو نابێت رۆژێك بێت کە ناسیونالیزمی کورد وەك شۆڤینیزمی تورك، فارس و عەرەب زیان بە بەرژەوەندی نەتەوەکان بگەیەنێت.

**کریستینا کۆیگنین:** حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەبێ ئینیستیتۆیەکی لێکۆڵینەوەی ژینوساید دابمەزرێنێت. هەرچەند کە راپۆرتی زۆر لە سەر ئەنفال و ژینوسایدەکانی دیکە ئامادە کراوە بەلام دیسان پێویستە ژینوسایدی کورد بەقووڵی شی بکرێتەوە.

ئەم شیکارییە دەبێ بە گوێرەی ڕێوشوێنە ئاکادیمیکە نێونەتەوەییەکان ئەنجام بدرێت . حکوومەتی هەرێمی کوردستان دەبێ لە ئەزموونی ئەرمەنییەکان کەڵك وەربگرێت چونکە ئەرمەنییەکان توانیان لەوە دا سەرکەوتن بە دەست بهێنن کە ژینوسایدی ١٩١٥ لە لایەن کۆمەڵگای نێونەتەوەییەوە بە فەرمی بناسرێت. لۆبی ئەرمەنییەکان لە واشنتۆن، پاریس و لەندەن لە ئەنجامی پشتیوانیی دوور و درێژ لە لێکۆلینەوە و توێژینەوەکان دەربارەی ژینوسایدی ئەرمەنییەکان وەدی هاتووە. بە فەرمیناسینی ژینوسایدی کورد ئاکام و لێکەوتەی سیاسی بە دواوەیە. گرنگییەکەی بۆ کورد لەوەدایە کە ئەو پێویستییە دەخاتەڕوو کە دەبێ ڕێگاچارەیەکی سیاسی بۆ کێشەی کورد بدۆزرێتەوە. ژینوسایدەکانی دیکەی جیهان، بۆ نموونە ژینوسایدی (رواندا) و (کامبۆج) لە لایەن توێژەرە ناوخۆیی و نێونەتەوییەکانەوە لێکۆڵینەوەی لەسەر کراوە . تەنها بە لێکۆلینەوەیەکی قووڵ دەکرێت دەرك بە گەورەیی و ئاڵۆزبوونی ژینوسایدی کورد بکرێت . بەهەرحاڵ ئێستاش مەترسی ژینوسایدی کورد، بەتایبەت لە ناوچە جیناکۆکەکاندا لە ئارادایە. بۆ ڕێگرتن لە شتێکی وا پێویستە دەرك بەوە بکرێت کە ئەم ڕەوتە چۆن هەنگاو بە هەنگاو لە کوردستاندا پەرەی سەندووە.

328. Barkey Henri J. "Kurdish Geopolitics." Current History 96, no. 606 (January 1997): 1-5. Part of an issue on the Middle East. The Kurds, the largest ethnic group in the world without a state, continue to fight among themselves and with the governments of the countries occupying them. In northern Iraq, protected as a safe haven by the United States under the guise of Operation Provide Comfort, the civil war between the Kurdistan Democratic Party (KDP) and the Patriotic Union of Kurdistan (PUK) has allowed Saddam Hussein to reassert himself in the safe haven by backing the KDP. Complicating matters is the Kurdish uprising in Turkey, started in 1984 by the Kurdistan Workers Party (PKK), the effects of which have increasingly dragged Turkeys Ankara government into the politics of the Middle East. Turkish fears of the PKK and suspicions of American intentions have interfered with Operation Provide Comfort and curtailed U.S. activities in the north of Iraq.

329. Bhattacharya, Sauri P. "The Situation of the Kurds in the Post-Gulf War Period and U.S. Policy Toward it." Asian Profile 22 (April 1994): 151-160. This is a study of the situation of a trans-national people, but the focus is on the Kurds of Iraq who were encouraged by the Bush administra¬tion to rise in rebellion against the Iraqi regime in the aftermath of Saddams defeat in the Gulf War. Questions about their geography, sociology, language, culture, as also a history of their movement for self-

determination since the 19th century are included. The Kurds fail¬ure in achieving self-determination in the past is not being replaced by anything really new and different. Americans, although they were expected to be of help to the Kurds in their effort to carve up a nation for themselves, seem overly cautious torn between two different direc¬tions: human rights, rule of law, and new world order on the one hand, and stability, domestic jurisdiction and the need to prove that their friendship for the Turks is real and reliable. This timid U.S. policy seems still determined by considerations of the Cold War.

330. Carley, Patricia. U.S. Responses to Self-Determination Movements: Strategies for Nonviolent Outcomes and Alternatives to Secession. Report from a roundtable held in conjunction with the policy planning staff of the U.S. Department of State. Washington, DC: United States Institute of Peace, 1997. viii, 30 p.: ill. Includes bibliographical references. Report on results of a U.S. Institute of Peace roundtable, held in conjunction with State Department Policy Planning Staff in March 1996 on U.S. and international policy responses to self-determination movements. Covers background on, and U.S. and/or international response to, self-determination movements of Kurds, Kashmir, Eritrea, and Tibet; self-determination, human rights, and good governance; case for secession; self-determination at the United Nations; and nonviolent alternatives to secession.

331. Central Intelligence Agency. The World Factbook. PRINT, WEB. Washington, DC: Central Intelligence

Agency: Supt. of Docs., U.S. GPO [distributor], 1981- . Annual. The CIA World Factbook provides a country-by-country listing of basic statistical and factual information. Each individual entry averages a few print pages in length. Major sections of each entry include "Introduction," "Geography," "People," "Government," "Economy," "Communications," "Transportation," "Military," and "Transnational Issues." Information such as population, type of legal system, national holidays, number of railroads, and military strength is included. The World Factbook also includes an appendix listing membership in selected U.N. and international organizations and a series of reference maps of the world. The World Factbook is an excellent source for obtaining a quick up-to-date overview of a country. The first classified Factbook was published in August 1962, and the first unclassified version was published in June 1971. The 1975 Factbook was the first to be made available to the public with sales through the US Government Printing Office (GPO). The 1996 edition was printed by GPO, and the 1997 edition was reprinted by GPO. The year 2001 marks the 54th anniversary of the establishment of the Central Intelligence Agency and the 58th year of continuous basic intelligence support to the US Government by The World Factbook and its predecessor programs. The Web-based version is made available at: www.cia.gov/cia/ publications/factbook/.

332. Congress. Congressional Record: Proceedings and Debates of the ... Congress. PRINT, WEB. Washington, DC: [Supt. of Docs., U.S. GPO, distributor], 1873- . Daily (when Congress is in session). This is a record of congressional debates and proceedings, messages to Congress, and voting records. Speeches and debates do not necessarily appear verbatim, however. Daily issues are cumulated annually into a permanent, bound, final edition for each session of Congress, creating differences in page number in and indexing between the daily and bound editions. The daily editions contain four sections: H (House proceedings), S (Senate proceedings), E (Extension of Remarks), and D (Daily Digest, a summary of daily activities). Pages in the bound volume are numbered in a single sequence. At sessions end, the Daily Digest is issued as separate part, with a subject index and a table of bills enacted into public law. There is a separate index to the permanent, bound Congressional Record which includes Daily Digest volumes. In the bound annual edition, Extension of Remarks are integrated into the body of the text. The Congressional Record is available in full text on the Web from the Government Printing Offices GPO Access Web site. Commercial online services, such as Congressional Universe, Westlaw, and LEXIS-NEXIS, also provide access to full text of the Record. Occasionally, the Congress, and its various committees and subcommittees, discusses the Kurdish question. The debates that originate from these discussions normally get published in the Record.

333. Congress. Commission on Security and Cooperation in Europe. Situation of Kurds in Turkey, Iraq and Iran. Washington, DC: The Commission, 1993. v, 35 p. [Implementation of the Helsinki Accords]. Congress Session: 103-1. SUDOC: Y4.SE2:H36/22. Transcript of Commission on Security and Cooperation in Europe (CSCE) briefing on the status of Kurdish minorities living in Turkey and Iraq, including human rights concerns. Mary Sue Hafner, Deputy Staff Director and General Counsel, CSCE, presents opening remarks and leads the briefing. Includes audience participation (p. 14-26). Supplementary material (p. 27-35) includes panelists written statements. Discusses Kurdish minorities in Turkey and Iraq, status and human rights concerns. Statements and Discussion include: Background on the situation of Kurds in the Middle East; concerns about the status of Kurds living in Turkey and Iraq, emphasizing human rights issues; suggestions regarding treatment of Kurdish minorities in Turkey and Iraq, citing regional implications.

334. Congress. Commission on Security and Cooperation in Europe. Situation of Kurds in Turkey, Iraq and Iran. Washington, DC: The Commission, 1993. 42 p. [Implementation of the Helsinki Accords]. Congress Session: 103-2. SUDOC: Y4.SE2:P23/3. The document contains a transcript of the briefing on the Kurdish minority in the Middle East held by the Commission on Security and Cooperation in Europe (CSCE) on May 17, 1993. The Kurds constitute the fourth largest nationality in the Middle East, primarily concentrated in the states of Iran, Iraq, and Turkey, and to a lesser extent in Syria. In all

countries, they lack institutional protection of human rights and individual freedoms. Includes a statement (pp. 27-32) by Dr. Mark A. Epstein on Kurdish identity and U.S. policy.

335. Congress. House. Committee on International Relations. Senate. Committee on Foreign Relations. Country Reports on Human Rights Practices. PRINT, WEB. Washington, DC: U.S. GPO, 1977- . Annual. (www.state. gov/g/drl/hr/c1470.htm). This report is issued as a joint committee print and submitted annually to the Congress by the Department of State. The report covers internationally recognized individual, civil, political, and worker rights, as set forth in the Universal Declaration of Human Rights. The human rights reports reflect a year of effort by hundreds of State Department and other U.S. Government employees. The U.S. embassies around the world which prepare the initial drafts of the reports, gather information throughout the year from a variety of sources, including contacts across the political spectrum, government officials, jurists, military sources, journalists, human rights monitors, academics, and labor union members. The draft reports are then reviewed by the U.S. Bureau of Human Rights and Humanitarian Affairs, in cooperation with other relevant offices in the State Depart¬ment. As they corroborate, analyze, and edit the reports, Department officers draw on their own additional sources of information. These include reports and consultations with U.S. and other human rights groups, foreign government officials, representatives from the U.N. and other international and regional organizations and

institutions, and experts from academia and the media. The Report covers human rights violations around the world. It describes a world where people who by right are born free and with dignity too often suffer the cruelties of authorities who deprive them of their rights in order to perpetuate their own power. It mainly covers countries that are ruled by dictators or rent by armed conflict, where bullets, torture, arbitrary detention, rape, dis¬appearances, and other abuses are used to silence those who struggle for political freedom; to crush those whose ethnicity, gen¬der, race or religion mark them for discrimination; or to frighten and mistreat those who have no defenses. Documents violations, and domestic and international reaction. Full-text of reports for the years 1996-2000 on Iran, Iraq, Syria, Turkey, and other countries can be found at the following addresses:

- 1996: www.state.gov/www/global/human_right s/1996_hrp_report/96hrp_report_toc.html

- 1997: www.state.gov/www/global/human_right s/1997_hrp_report/97hrp_report_toc.html

- 1998: www.state.gov/www/global/human_right s/1998_hrp_report/98hrp_report_toc.html

- 1999: www.state.gov/g/drl/rls/hrrpt/1999/

- 2000: www.state.gov/g/drl/rls/hrrpt/2000/

- 2001: www.state.gov/g/drl/rls/hrrpt/2001/

